پڕۆژەی بەهای فەرمووده







صلى الله عليه وسلم

# فەرموودەی پێغەمبەر



نووسینی

سيروان كاكه أحمد



# ٢٢٠
# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

نووسینی : سیروان کاکە أحمد
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی
چاپی دووەم ١٤٤١ك- ٢٠٢٠ز
١٤* ٢١ سم ، ١٧٠ لاپەڕە
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٨٩٧ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە




پڕۆژەی بەهای فەرموودە

# ٢٢٠
# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ


نووسینی

سیروان کاکە أحمد



١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

رَبِّ يَسِّرْ أَعِنْ، يَا كَرِيم

## پێشەکی

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێ کردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەرێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره»[1].

لەم فەرموودە دوعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.

بێگومان لە خزمەت دابوونی قورئان، واتە: لە خزمەتدا بوونی خوای بەرز! چ خۆشحاڵیەکی تێدایە کاتێك بەندە لە خزمەتی پەروەردگاری خۆیەتی و گوێی بۆ گرتوە، وە دەست گرتن و کارکردن بە قورئان، هۆکارە

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦٧٨٤، وصحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط.

بۆ بە دەستهێنانی سیفەتە بەرزەکانی قورئان، بۆ وێنە: قورئان مەزنە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، مەزن دەبێ، قورئان خۆشەویستە هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، خۆشەویست دەبێ، قورئان بەخشندەیە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، بەخشندەو سەخی دەبێ..

دیارە لە خزمەت دابوونی فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، واتە: لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەمان ئەو سیفەتانەت پێ دەبەخشێ کە قورئان بە خاوەنەکەی و هاوەڵەکەی دەبەخشێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کردارو گوفتارو ڕەفتارو گشت هەڵسوکەوتەکانی قورئانێکی بەرجەستە کراو بوو کە لەسەر زەوی دەڕۆیشت... پێشم وانیە هیچ کاتێك وەك ئێستا مسوڵمانان ئاوا موحتاجی ئەوە بووبن جارێکی دی بچنەوە قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك قوتابیەك لە خزمەتی لەسەر چۆك دابنیشن و گوێ لە فەرمایشتە موبارەکەکانی ڕابگرن و لەبەری بکەن و تێیبگەن و کاری پێبکەن و خۆیانی پێ برازێننەوە، پاشان خەڵکی لێ فێر بکەن.

ژیان لەگەڵ فەرموودە شیرینەکانی خۆشەویستی خوا ﷺ تام و چێژو لەززەتی تایبەتی خۆی هەیە، ژیانە لەگەڵ بەڕێزترین مەخلوق، ژیانە لەگەڵ سەرەتای هاتنی وەحی و نبووەت، ژیانە لەگەڵ جیلێك کە باشترین جیلی سەر زەوی بوون و (خیر القرون) بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، ژیانە لەگەڵ دونیایەکی زۆر جیا لەم دونیا ماددیە وشکە!

## پێگەی سوننەت لە ئیسلامدا

گومان لەوەدا نیە کە ناحەزان و تێنەگەیشتووان لە ئیسلام بە جۆرەها شێوە دێن گومان لەسەر ئیسلام دروست دەکەن و دەیانەوێ بە فووی دەمیان ڕووناکی خۆری ئیسلام بکوژێننەوە، ئەم کارەشیان بەردەوامە، یەکێك لە کارەکانیان بریتیە لە هەوڵدان بۆ ڕەت کردنەوەی سوننەت بە گشتی، وە دەڵێن: قورئان بە تەنیا کافیەو پێویستمان بە حەدیس نیە، مەبەستیش لەم بانگەشە پیسە لە ناوبردنی شەریعەتی ئیسلامە، چونکە دیارە سوننەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، بۆیە تانەدان لە سوننەت، تانەدانە لە قورئان، ئا ئەم بانگەشە پووچە لە کۆتایی جیلی زێڕینی هاوەڵان سەری هەڵدا، وردە وردە تەشەنەی کرد تا دواتر گەیشتە ئەم نەوەی ئێستا.

ئیتر بەردەوام زانایان بەرپەرچی گومانەکانیان داونەوە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، وە ئێمە هەر زۆر بە کورتی ئاماژە بە چەند بەڵگەیەك دەکەین کە گەورەیی و پێگەی سوننەتمان بۆ دەردەخەن، بۆ هەر کەسێك کە خوا ڕێنمایی بکات و خۆشی بە دوای هەقدا بگەڕێ.

دەڵێین: سوننەتی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی موعتەبەری لەسەرە کە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، سوننەت هەم وەك چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، هەم وەك خۆی کە بۆ حوکمێکی سەربەخۆ گوتراوە، وە چەندین بەڵگە لە قورئان هەن فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺو، شوێنکەوتنی سوننەت، وە بە پێچەوانەوە هەڕەشەو ورياکردنەوەی زۆر هەن بۆ ئەوانەی پێچەوانەی سوننەت هەڵسوکەوت دەکەن، با سەرنجی چەند دەقێك بدەین:

دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾آل عمران، **واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خوای پەروەردگاریش خۆشتانی دەوێ.**

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾ ﴾النساء، **ئا لێرەدا خوای پەروەردگار گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری ﷺ بە گوێڕایەڵی خۆی داناوە.**

**دوا ئایەت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی فەرموویەتی:** ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾الحشر، **واتە: هەر شتێك لە فەرمان کە پێغەمبەر بۆتانی دێنێ و پێتان دەڵێ وەری بگرن و جێبەجێی بکەن، وە کە قەدەغەشتان دەکات لە هەر شتێك، وازی لێ بێنن و ئەنجامی نەدەن.**

**کە هیچ گومان لەوەدا نیە، ئەم دەقە هەم وەرگرتنی قورئان و هەم وەرگرتنی فەرمووده دەگرێتەوە.**

**لە ڕاستیدا بەبێ سوننەت هیچ کەسێك ناتوانێ دینداری بکات، ئێمە وەك مسوڵمانان ڕۆژانە پێویستیمان بە فەرمووده شیرینەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، تا لە کاروباری ژیانی ڕۆژانەمان بە کاریان بێنین و بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار بکەین.**

## دەربارەی: خودی پێغەمبەر ﷺ

پێش ئەوەی بێمە سەر هێنان و نووسینی فەرموودە شرینەکانی خۆشەویست ﷺ، بە پێویستی دەزانم شتێکی گرنگ بکەمە دیاری و خەڵاتتان، ئەویش: (شێوەی حەقیقی پێغەمبەر ﷺ و هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی)!

کە ئەمە جیاوازە لە گوفتارەکانی صلی اللّه علیه وسلم..

ئیتر هەر ئێستاکە، لەم کاتە ناسك و پیرۆزەدا، کە خوای تعالی هاتۆتە ئاسمانی یەکەمو سێیەکی شەوە، هاتنێك کە شایستەی خۆیەتی، لە خزمەت خۆشەویست ﷺ دامە، باسی کردارو گوفتارو هەڵسوکەوتە جوانەکانی دەنووسمەوە، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، لە ناخی دڵم بۆی دەبرژێم و بۆی دەکوڵێم، هەر خوا دەزانێ حاڵم چۆنە لە دووری خۆشەویستەکەم ﷺ، داوا دەکەم و دەپاڕێمەوەو دەستی نزام بەرز دەکەمەوە بۆ لای خوای بەخشندەو میهرەبانم، دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! لێت دەپاڕێمەوە بە ناووسیفەتە بەرزەکانت، هەر کەسێك خۆشەویستی حەقیقی لە دڵدا هەیە بۆ خۆشەویستەکەت ﷺ، ئەم پێغەمبەرە نازدارەی بێنە خەونی و پێی پێشان بدە... هەروەك چۆن ئەم چاکەت لەگەڵ بەندەی خۆت کرد، لەگەڵ گشت بەندەکانی دیکەشتدا ئەم بەزەییە بنوێنە، اللّهم أمین.

## شێوەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك من بینیم

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی بەلای سپیدا بوو، چاوی موبارەکی گەورەو ڕەش بوو، جوانیەکەی لەوەدا بوو، سپیەکەی نێو چاوی زۆر بوو، وە زۆر صاف بوو، برژانگەکانی درێژ بوون، زۆر زۆر بە ویقارو گران و سەنگین بوو، ئا لێرەدا بۆم بە دەرکەوت کە هاوەڵان دەیانگوت: نەماندەتوانی تەماشای نێو چاوی بکەین، وەڵڵاهی زۆر ڕاست دەکەن، چوارشانەو شان پان بوو، بە خوا لە هەموو کەس جوان و ڕێك و پێکتر بوو، باڵای بەرز بوو، بە داخەوە پرچیم نەدی، عەمامەی لەسەر سەری بوو، شێوەی عەمامەی سەری موبارەکی: عەمامەکی مام نێوەندی بوو، ڕەش بوو، وێنەی کەم بوو لە جوانی..

جا لەو کاتە رسول اللّه ﷺ ڕاوەستا بوو زۆر بە جوانی، خۆزگە دەشم بینی بڕۆیشتایە، تا بمتوانیبا وەسفی بکەم و چاوی لێ بکەین، کەمێك ڕیشی موبارەکی سپی بوو بوو، وەڵڵاهی جوانترین دەم و لووت و چاوی هەبوو. یا اللّه لەم جەمال و جوانیەی جەنابی رسول اللّه ﷺو، لەو خۆشیەی من کە تێیدا بووم، لەو دڵتەنگی و ناخۆشیەی کە لە خەو هەڵسام.. دەتوانم بڵێم: بە ئەندازەی دڵخۆشی خەوم، دڵتەنگ بووم کە لەخەو هەڵسام. خۆزگە هەڵنەستامایەوە، دەستی لە دەستم دەرنەهێناباو بە هەمیشەیی پاڵکەوتمایەو لە خزمەتی خاتم الأنبياء، حبيب اللّه، إلى الأبد بحەسابامایەوە، ئاخر چ لەوە ناخۆشترە لەم زاتە پاك و موبارەکە جیابکرێیەوە؟! وەڵڵاهی کە هەڵسام خۆزگە هەڵنەستامایەوە، زۆر هەوڵم دەدا بخەومەوەو بچمەوە نێو خەوەکەو خەونەکە نەپچڕێ بێ ئاگا لەوەی ئەمە مەحاڵە!! یا رب لەو خۆشیەی بە منتدا بە هەموو ئەوانەشی بدە کە داوات لێدەکەن و، بە دڵ و بە کردار لە خزمەتی رسول اللّه ﷺ دان، اللّهم أمين.

## ئەوەی لەسەریم ﷺ خوێندۆتەوە

که تووڕه دەبوو ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا، کە دڵخۆش دەبوو ڕەنگی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، کە دەڕۆیشت کەمێك پەلەی پێوە دیار بوو، تا وەك نەخۆش دەرنەکەوێ، کە قسەی دەکرد لەسەرخۆو هێمن بوو، زۆرجار بە خزمەتکارەکەی دەفەرموو: پێویستت بە من هەیە؟ زۆربەی کات بێدەنگ بوو، کەم دەدواو زۆر بیری دەکردەوە، بە دەنگ پێنەدەکەنی، زۆربەی کات زەردەخەنەی لەسەر لێو بوو، دیاری وەردەگرت و خێرو صەدەقەی وەرنەدەگرت، پۆشاکی خۆی دەدوریەوەو نەعلی خۆی چاك دەکردەوە، بە هەر کوێ بڕۆیشتایە بە بۆنە خۆشەکەی دەناسرایەوە، زۆر زیکرو یادی خوای دەکرد، قسەی بێ سوودی نەدەکرد، لەگەڵ هەر کەس قسەی کردبا، ئەو کەسە وای هەست دەکرد لە هەموو کەسی خۆشتر دەوێ! ئەزیەتی کەسی نەدەدا، نە بە گوفتار، نە بەکردار، دڵی پڕبوو لە خۆشەویستی و موحەببەت، گوێی لە هەموو کەس دەگرت و بە پێی توانای هاوکاری دەبوو، لەسەر خودی خۆی لە کەس تووڕە نەدەبوو.

لە کۆتایی: ڕۆژێك ڕووی لە خەڵك کردو فەرمووی:

سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە! ئەمڕۆ هیچ شتێك لەلای خاوو خێزانەکانی موحەممەد نیە، نە لە خۆراك و نە لە خورما..!

## دەربارەی: خوا مەبەست بوون لە کردەوەی چاك

(الإِخْلَاصُ: نسيان رُؤية الخلق، بدوام النَّظر إلى الخَالق) واتە: (إخلاص) بریتیە لە لەبیر کردنی ئەوە کە خەڵك تەماشات دەکەن، بە هۆی بەردەوامی تەماشا کردنی خواوە.

١- {عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»}[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەسەر مینبەر گوتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەیفەرموو: بێگومان (قبووڵ بوونی) کردەوەکان بە پێی نیازەکانە، وە هەموو کەسێك بە پێی نیازەکەی پاداشت دەدرێتەوە، جا هەر کەس کۆچ کردنی بۆ بەدەستهێنانی (دەستکەوتێکی) دونیایی بێ، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك بێ، ئەوە کۆچ کردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردوە. (مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە نیازو مەبەست بنچینەو بنەمای هەموو کارێکە).

٢- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ، جَعَلَ اللَّهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ، جَعَلَ اللَّهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ»}[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕۆژی دوای بکاتە جێی مەبەست و بایەخی، خوا بێ نیازی و

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١، وَمُسْلِم: ٤٩٠٤.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٢٤٦٥، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ٣١٦٩.

دەوڵەمەندی دەخاتە نێو دڵی، وە کاروباری (دونیای) بۆ کۆدەکاتەوەو دونیاش بە ملکەچی دێتە ژێر دەستی، بەڵام هەر کەسێك دونیا بکاتە جێی مەبەست و بایەخ پێدانی، خوا هەژاریی دەخاتە نێو چاوی و (هەمیشە هەست بە هەژاری و موحتاجی دەکات و بێ قەناعەت دەبێ)، وە کاروباری لێ بڵاو دەکات، لە دونیاش تەنیا ئەوەندەی بۆ دێت کە بۆی بڕیاردراوەو ئەندازەکراوە.

٣- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلًا غَزَا يَلْتَمِسُ الأَجْرَ وَالذِّكْرَ مَا لَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا شَيْءَ لَهُ فَأَعَادَهَا ثَلَاثَ مَرَاتٍ يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لا شيء لَهُ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّه لاَ يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ»}[١].

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ گوتی: قسەت لەسەر کەسێك چیە کە غەزا دەکات لە پێناو بەدەست هێنانی پاداشت (لەلای خوا)و، بۆ ئەوەش خەڵك بە چاکە باسی بکەن؟ ئەو کەسە چی بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسە هیچی بۆ نیە، پیاوەکە سێ جار (پرسیارەکەی) دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (ئەو کەسە) هیچی بۆ نیە، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بێگومان (لە ڕۆژی دوایی) خوا هیچ کردەوەیەکی باش وەرناگرێ، مەگەر ئەو کردەوەی کە بە پاکی و بە مەبەستی ڕەزامەندی ئەو ئەنجام درابێت.

٤- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»}[٢].

---

(١) أَخْرَجَهُ النَّسَائِي: ٣١١٤، قال الألباني: حسن صحيح، انظر: (صحيح الجامع): ٣٢٣٣.
(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٧٤٢، وَمُسْلِم: ١١٢.

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوی وا هەیە ئەوەندەی خەڵك بۆیان دەردەکەوێ کردەوەی بەهەشتیان ئەنجام دەدات، کەچی ئەو کەسە دۆزەخییە، وە پیاوی واش هەیە ئەوەندەی بۆ خەڵك دەردەکەوێ کردەوەی دۆزەخیان دەکات، کەچی لە ڕاستییدا ئەو کەسە بەهەشتییە.

## پێناسەی ئیمان

لە ئەسڵی زماندا: بریتیە لە بە ڕاست دانان و دان پێداهێنان.

لە زاراوی شەرعدا: بریتیە لە بڕوا بوون لە ناخی دڵ و دانپێداهێنان بە زمان و جێبەجێی کردنی (هەر شتێکی کە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرموویانە، بە پێی تواناو بۆ گونجان) بە ئەندامەکانی لاشە.

شایانی باسە، ئیمان لای ئەهلی عیرفان و عاریفان پێناسە ناکرێ، بەڵکو ئەزموون دەکرێ، وەك لە وەڵامی پرسیاری گەنجێك کە لە ئەبو حامدی غەزالی دەپرسێ: ئایا پێناسەی ئیمان چیە؟ ئەویش دەڵێ: ڕۆڵە گیان! ئیمان پێناسە ناکرێ، بەڵکو دەچێژرێ.. ئەمەش چەندین فەرمایشتی صەحیحی لەسەرە[1].

دیارە وەك لە ناوونیشانەکە باسمان کردوە، ئیمان و پایەکانی، کەواتە: ئیمان پایەی هەن، بە پێی ئەوەی لە قوڕئان و لە فەرمایشتە صەحیحەکان بە ئێمەی گەیشتووە:

خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ .. (١٧٧) ﴾ البقرة.

واتە: چاکەکاریی هەر ئەوە نیە کە ڕووی خۆتان بکەنە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکە (چاکەی) کەسێکە بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێب و پێغەمبەران بێنێ..

---

(١) {عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ طَعْمَ الْإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلّٰهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللّٰهُ مِنْهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ}، أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي ٢٦٢٤، وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

خوای بەرز لێرەدا پێنج لە پایەکانی ئیمانمان بۆ باس دەکات کە بریتین لە: بڕواهێنان بە خوا، ڕۆژی دوایی، فریشتەکان، کتێبە ئاسمانییەکان، پێغەمبەران.

وە لە سوننەتیش ئەم ڕیوایەتە هـــاتوە، کە بە فەرمـــوودەی جبریل مەشهوورە، کاتێك جبریل پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، دەڵێ: هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیمان؟ پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ لە پێناسەی ئیمان کە وەڵامی پرسیارەکەی جبریلە ﷺ ئاوا دەفەرموێ:

٥- {عَنْ عُمرَ بْنِ الْخطّاب ﷺ، عَن النّبيّ ﷺ: «الإِيمَانُ: أَنْ تُؤْمنَ باللّه، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَاليَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»}[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیمان بریتیە لەوەی بڕوابێنی بە خواو، بە فریشتەکانی و، کتێبەکانی و، پێغەمبەرەکانی و، ڕۆژی دوایی، وە ئیمان بێنیت بە قەدەر بە چاك و بە خراپییەوە.

٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ يَوْمَاً بَارِزَاً لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللّهِ، مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللّهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكِتَابِهِ، وَلِقَائِهِ، وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الآخِرِ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو خەڵکدا لە شوێنێکی دیاردا، پیاوێك هاتە لای و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمان چییە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئیمان ئەوەیە بڕوابێنی بە خواو بە فریشتەکانی و، کتێبەکەی و، بە گەیشتنەوە پێی و، بە پێغەمبەرەکانی و، بڕواش بێنێت بە زیندووبونەوەی (ڕۆژی دوایی).

---

(١) أَخرَجَهُ مُسلِم: ٨.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٤٤٩٩، وَمُسلِم: ١٠٦.

جێی سەرنجە!

پایەی شەشەم کە بڕوانە (قەزاو قەدەر)ە، لە هیچ شوێنێکی قورئاندا نەهاتوە، کە بەشێك بێت لە ئیمان! ئەمەش ڕەنگە جێی پرسیار بێ لای هەندێ کەس، وەڵامەکەی ئەوەیە:

لەبەر ئەوەی ئیمان بە (قەزاو قەدەر) بریتیە: لە ئیمان بە زانیاری خواو، بە توانای خواو، بە ویستی خواو، بە حیکمەت و دادگەریی خوا..

کەواتە: ئیمان بە خوا، ئیمان بە قەزاو قەدەریش دەگرێتە خۆی، بۆیە خوای زاناو شارەزا باسی نەکردوەو لە ئایەتەکاندا نەهاتوە.

خوێنەری خۆشەویست:

دوای ئەوەی زانیمان ئیمان شەش پایەی هەیە، پێویست دەکات، بە کورتی و گوشراوی باسی هەر یەکێك لە پایەکانی ئیمان بکەین و چەند فەرموودەیەکیشیان دەربارە بێنینەوە:

## بڕواهێنان بە خـــوا ﷻ

کە دەڵێین: دەبێ بڕوامان بە خوا هەبێ، واتە: لە ناخی دڵمانەوە بڕوامان وایە کە خوا هەیە، پێش ئەو هیچ کەس و هیچ شتێك بوونی نەبووە، وە هەرچی لە ئێستاو پێش ئێستاو دوای ئێستاش دێ، بوونەکەیان لە خوای بێ سەرەتاو کۆتا وەرگرتوە، خوای تعالی خۆی سەرەتایەکی نەبووە بۆ بوون، تاکو کاتی بدەینە پاڵ و بڵێین لە فلان کاتە بوو، وە شوێنیش نەبوو تاکو بگوترێ: خوای تعالی لە فلان شوێن بوو، چونکە کات و شوێن بە نسبەت ئێمەوە هەن، بەڵام بە نسبەت خوای بێ وێنەوە هیچ شتێك نیە بە ناوی کات و شوێنەوە، لەبەر ئەوەی خۆی دروستکاری کات و شوێنە،

**کەواتە: کاتێك خوا هەبووە، نە کات و نە شوێن وجوودیان نەبووە، تاکو خوای بەرز پاڵبدرێتە لایان، وەك شاعیرێك دەڵێ:**

مَنْ أيْن آيْن يُنْتَمى إلَيه          مَتى متى حتى أتـى عليْه

**شوێن لە کوێ بوو تــا خـــوای پـاڵدرێتەلا**
**کات کەی هەبوو تا بەسەر خوا تێپەڕبووبێ**

**بێگومان لە دوای دونیا تێکچوون و زیندوو کردنەوەی مردووان بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ کردنیان و، ڕەوانەکرانی چاکەکاران بۆ بەهەشت و خراپەکاران بۆ دۆزەخ هەر دەمێنێ.**

**کەواتە: خوای بێ وێنە یەکەم و بێ کۆتاییە، زیندووەو ڕاگری گشت کاروبارێکە، دروستکاری هەموو شتێکە، هەموو کەسێك و شتێك پێویستیان بەو هەیەو، ئەو پێویستی بە غەیری خۆی نیە، نە کەسی لـێ بووەو، نە لە کەس بووە، بە هیچ جۆرێك هاووێنەو هاوتای نیە، تاك و تەنیایە، هەر ئەو پەرستراوو پەروەردگاری بە هەقە، وە لە سیفەتەکانی دا بە پاك گیراوەو بە هیچ جۆرێك لە دروستکراوەکانی ناچێت، دەبێ ئیمانمان بەو ناوو سیفەتانەی هەبێت وەك لە قورئان و فەرمووده ڕاست و دروستەکاندا هاتوون.**

**پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خوای بەرز ئەمەی لێ گێردراوەتەوە:**

**٧-** [عَنْ أَبِي هُرَيرة ﷺ، أنَّ رسُول اللّه ﷺ قال: «إنَّ للّه تسعةً وتسعين اسْمًا، مائةً إلاَّ واحداً منْ أحْصاها دخل الْجَنَّةَ»][١].

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي في: ٥٤ كتاب الشروط: ٨١ باب ما يجوز من الاشتراط وفي: ٨٠ كتاب الدعوات: ٦٨ باب لله مائة اسم غير واحد، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)، ئەم بابەتە دەقاو دەق لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون) وەرگیـراوە.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەیە، سەد جگە لە یەکێك، هەر کەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت.

## (٩٩) ناوەکەی خوای بەرز، بە کوردی

بە بەزەیی، بەخشندە، پاشا، پاك، بێ عەیب، بێ پەڵە، دڵنیاکەر، بە ڕاستدانەر، بەسەرڕاگەیشتوو، زاڵ و دەستەڵاتدار، باڵادەست، ناچارکەر، خۆ بەگەورە زان، دروستکەر، بنیادنەر، بەدیهێنەر، وێنەکێش، لێبووردە، گەردنکەچکەر، بەخشەر، ڕۆزی دەر، دەروو کەرەوە، زانا، لێگرەوە، وێکهێنەر، فراوانکەر، دانەوێن، نزمکەر، بڵندکەر، زاڵکەر، عیززەت بەخش، زەبوونکەر، مل پێ کەچکەر، بیسەر، بینەر، فەرمانڕەوا، حوکمڕان، دادگەر، چاکە کاری پەنهان، وردبین و شارەزا، هەواڵدەر، هێدی و مەند، ئارام، مەزن، لێبوردە، گوناح پۆش، ستایشکەر، سوپاس گوزار، بەرز، گەورە، پارێزەر، بژێو گەیێن، دەستەڵاتدار، لێپرسەرەوە، سیفەت بەرز، پایە بەرز، بەڕێز، ڕێزگر، چاودێر، وەڵامدەرەوەی پاڕانەوە، فراوان، کاربەجێ، لێزان، بەندە دۆست، خۆشویستراو، پایە بەرز، خاوەن شکۆ، زیندووکەرەوە، نێرەر، ئاگادار، ئامادە، پایەدار، ڕاست، کارپێ سپێرراو، پشت و پەنا، بە توانا، بەهێز، قایم، دۆست، یاریدەدەر، سوپاس کراو، شایستەی سوپاس، ژمێرەر، پەیداکەر، گێڕەرەوە، زیندووکەرەوە، ژیێنەر، مرێنەر، زیندوو مشوورگێڕ، ڕاوەستاو، هەر هەبوو، خاوەن پایەی بەرز، یەك، تاك، تەنیا، بێ نیازو جێی نیاز، تواناداار، خاوەن سەرچاوەی توانا، پێشخەر، دواخەر، یەکەمین، دوامین، دیار، ئاشکرا (واتە: زۆر ڕوون و ئاشکرایە بە سیفەتەکانی)، پەنهان (ون و نادیارە بە زاتی خۆی، لە دونیا زاتی خوا نابینرێ)، سەرپەرشتیکار، زۆربەرز، خۆبەرزگر، چاکەکار، تۆبە وەرگر، تۆڵە

**ستێن، چاوپۆشیکەر، میهرەبان، خاوەن موڵك، خاوەن پایەی بەرزو ڕێز، دادپەروەر، کۆکەرەوە، دەوڵەمەند، دەوڵەمەندکەر، بێ نیازکەر، بەرگر، پێشگیرىکەر، زیان گەیێن (بە دوژمن و ناحەزانی)، سوودگەیێن (بە دۆست و خۆشەویستەکانی)، ڕووناکی، ڕێ پیشاندەر، داهێنەر، بێ وێنە، هەرماو، میراتگر، کارزان، شارەزاکەر، ئارامگر، هەروەها لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئاوا وەسف و پێناسەی خوای بەرزو مەزنمان بۆ دەکات، دەفەرموێ:**

٨- {عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ لاَ يَنَامُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ، وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ "وَفِي رِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ النَّارُ" لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ»}[1].

**واتە: ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەڵسا بە گوتنی پێنج وشەو فەرمووی: بێگومان خوای زاڵ و پایە بەرز ناخەوێ، وە ناشگونجێ کە بخەوێ، تەرازوو نزم دەکات و بەرز دەکات، کردەوەی شەو پێش ڕۆژی بۆ لای بەرز دەکرێتەوە، کردەوەی ڕۆژیش پێش شەوی بۆ لا بەرز دەکرێتەوە، پەردەی خوا ڕووناکییە، (وە لە ڕیوایەتی ئەبو بەکردا دەڵێ: ئاگرە)، ئەگەر خوا پەردەکەی لابدات پڕشنگەکانی ڕووی خوا هەرچی لە حوکمی ئەندازەی بینینی خوادایە هەمووی دەسووتێنێ (واتە: گشت بوونەوەر دەسوتێنێ، چونکە بینینی خوا سنوری نیەو گشت شتێك دەگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەم سوتانە هەڵدەگرێ لەسەر بەهەشتیان کاتێ خۆیانیان پێشان دەدات).**

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٧٩.

لە ڕاستییدا ئیمان بە ناوو سیفەتەکانی خوای بەرز عەقیدەیەکی چەسپاوو دامەزراو بە ئینسان دەبەخشێ و وای لێدەکات لە زۆر هەورازو نشێوان لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێ و بەردەوام بێت.

خوێنەری بەڕێز!

ئا لێرەدا هۆکاری نەتوانینی بینینی خوای پەروەردگارمان لە دونیادا بۆ دەردەکەوێ! کەواتە: ئێمە بەم جەستە خاکییەوە، هەرگیزو هەرگیز تەحەممولی بینینی خوا ناکەین، سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەر خوای پەروەردگار خۆی پێشانی ئێمەدا بووایە، ئەو کاتە ئێمە لەوە دەردەچووین تاقی بکرێینەوە، وە لە ڕاستییشدا ئیمان بە خوا کاتێك دێتە دی کە خوا پەنهان بێ و نەبینرێ، وە بە دڵنیایی شتێك کە بیبینی، ئیمان پێ بوون زۆر ئازایەتی نیە و، ناکرێ بە تاقیکردنەوە دابنرێ.

لە کۆتایی دەڵێم: خوای تعالی ئەگەرچی خۆی لێ پەنهان کردووین، بەڵام هەزاران نیشانەو ئایەت و بەڵگەو موعجیزەی درەوشاوەی هەن، کە دەتوانین وەك ڕۆژی ڕووناك خوای پەروەردگاریان تێدا بەدی بکەین، وەك شاعیر دەڵێ:

وَفِي كُـلِّ شَيْءٍ لَـهُ آيَـةٌ     تَـدُلُّ عَـلَـى أَنَّـهُ وَاحِـدٌ

لە هەر شتێکدا نیشانەك هەیە     بەڵگەن لەسەروەی کە یەك خوا هەیە

دوای ئەوە، کە ئێمە دەزانین ئەو خوایە بەرزو مەزنەمان هەیە، بەو هەموو سیفەتە جوان و چاك و کامڵانەوە، زۆر گرنگ و پێویستە بزانین چ ئەرك و مافێکی بۆ داناوین؟ وە لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەرکی سەر شانمان وەك ماف، چ پاداشتێکی بۆ داناوین.

## خوا ﷻ چی دەوێ لێمان؟ وە چیمان پێ دەبەخشێ؟

٩- {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «يا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللّٰهِ عَلَى الْعِبَادِ؟»، قَالَ: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَنْ يُعْبَدَ اللّٰهُ وَلاَ يُشْرَكَ بِهِ شَيْءٌ»، قَالَ: «أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟»، فَقَالَ: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»}[1].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی موعاز، ئایا دەزانی مافی خوا بەسەر بەندەکانیەوە چییە؟ دەڵێ: منیش گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە کەوا بە جوانی بیپەرستێ و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدات. فەرمووی: ئایا دەزانی مافی ئەوان بەسەر خواوە چییە، ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا کرد؟ گوتم : خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (مافیان بەسەر خوا) ئەوەیە کەوا هیچ سزایەکیان نەدات.**

١٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «يَأْتِي الشَّيْطانُ أحدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذا؟ مَنْ خَلَقَ كَذا؟ حتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فإذا بَلَغَهُ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللّٰهِ وَلْيَنْتَهِ»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان دێتە لای یەکێکتان، دەڵێ: ئەمە کێ دروستی کردوە؟ ئەدی ئەمەیان کێ دروستی کردوە؟ هەتا دەڵێ: کێ پەروەردگارتی دروستی کردوە؟ جا ئەگەر گەیشتە ئەو ڕادەیە، با ئەو مرۆڤە پەنا بگرێ بە خواو (بڵێ: أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)و واز بێنێ.**

---

(١) أَخرَجَهُ مُسلِم: ١٥٤.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٣١٠٢، وَمُسلِم: ١٣٤.

## بڕواهێنان بە فریشتەکان

مەبەست ئەوەیە بڕوا بهێنرێ بە سەرجەم فریشتەکان، چ ئەوانەی ناویان هاتوە، چ ئەوانەی ناویان نەهاتوە، بڕوامان وابێ خوای بەرزو مەزن: فریشتەکانی دروست کردوون، ئەوانیش بەندەی خوان، لە نوور دروست کراون، خاوەن هەستن، بە ئیش و کارێك پێیان سپێردراوە، هەڵدەستن زۆر بە ڕێك و پێکی و بێ دواکەوتن، شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوەیان ئاسمانە، دروستکراوانێکی زۆر گەورەو تایەتن، خاوەن باڵن و گەشت دەکەن، سەرپێچی فەرمانەکانی خوا ناکەن، ژمارەی باڵەکانیان جیاوازە لە فریشتەیەك بۆ یەکێکی دیکە، هەیە دوو باڵی هەن، هەیە سێ باڵی هەن، جبریل شەش سەد باڵی هەیە، زۆر زۆر جوان و خاوەن شەرم و حەیان، توانایان هەیە لەسەر شێوەی غەیری حەقیقی خۆیان خۆ ڕابنوێنن، بە پێی ئەو کارەی پێی هەڵدەستن، بەندەی زۆر بەڕێزو، هەرە نزیکن لە خوای بەرز، نە نێرن، نە مێن و، بە هیچ شێوەك هاوسەرگیریی ناکەن و ژمارەیان زیاد ناکات، نە دەخۆن و نە دەخۆنەوە، بەڵکو هەمیشە لە تەسبیح و زیکرو یادی خوای تعالی دان، هەمیشە لە ژێر ترس و فەرمانی خوادان و بە هیچ جۆرێك سەرپێچی خوا ناکەن، بە پێچەوانەی مرۆڤ، ژمارەیان لە لای مرۆڤ نەزانراوە، هەر خوا دەزانێ چەندن.

### ناوی هەندێك فریشتە و ئەرکەکانیان

یەك: هەیانە تایبەت بە هێنانی (وحي) سرووش لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکانی خوا، ئەویش (جبريل الأمين)ە.

دوو: هەیانە تایبەتە بە باراندنی باران و، هێنان و بردنی هەورەکان، ئەویش (میکال) یان (میکائیل)ە.

سێ: هەیانە تایبەتە بە لێدانی نەفخی صووری دونیا تێکچوون و زیندوو کردنەوەی دروستکراوەکان، ئەویش (إسرافیل)ە.

چوار: هەیانە تایبەتە بە کێشانی ڕووحەکان، وەك (ملك الموت)و ئەوانەی لەگەڵین لە فریشتە بەڕێزەکان.

پێنج: هەیانە تایبەتە بە نووسین و تۆمار کردنی کردەوە باش و خراپەکانی مرۆڤ، ئەوانیش: (الكرام الكاتبون)ن، ئەو فریشتەی لای ڕاست چاکە دەنووسێ، وە فریشتەی لای چەپ خراپە دەنووسێ.

شەش: هەیانە هەمیشە بە دوامانەوەن، وە شوێن و جێگەشیان دەگۆڕن لە ڕۆژو شەوێکدا، لە دوو کاتی دیاری کراودا، ئەوانیش: لە دوای نوێژی بەیانی و، لە دوای نوێژی عەسر.

حەوت: هەیانە فریشتەی گەڕۆکن، لەسەر زەوی دەگەڕێن بە دوای مەجلیسی خوێندنی قورئان و فەرموودەو زیکرو ... هتد.

هەشت: هەیانە ئەرکی پاراستنی مرۆڤە لە کاتی خەوتوویی و بە ئاگایی و لە گشت حاڵەتەکانی دیکە.

نـــۆ: هەیانە تایبەتن بە تاقیکردنەوەو پرسیار کردنی نێو گۆڕ ئەوانیش: (منكر ونكير)ن.

دە: هەیانە تایبەتن بە کاروباری بەهەشت کە (خزنة الجنة)ن، وە لە پێش هەمووشیانەوە فریشتە (رضوان)ە.

یازدە: هەیانە تایبەتن بە کاروباری دۆزەخ، کە (خزنة النار)ن، وە لە پێش هەمووشیانەوە فریشتە (مالك)ە.

دوازدە: هەیانە لە کاتی جەنگ و جیهاد هاوکاری گروپ و کۆمەڵی ئیماندارانی تێکۆشەری ڕاستەقینە دەکەن.

## چەند فەرمایشتێك لەبارەی فریشتەكان

١١- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُلِقَتِ الْمَلائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتە لە ڕووناكی دروست كراون، وە جنەكانیش لە ئاگر دروست كراون، وە ئادەمیش لەوە دروست بووە كە بۆتان باسكراوە، (ئەویش بریتیە لە قوڕ، قوڕیش بریتیە لە ئاو + خۆڵ).**

١٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَعَاقَبُونَ فِيْكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيْكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێك فریشتە بەڕۆژو هەندێك فریشتە بە شەو بە دواتانەوەن (چاودێرن بەسەرتانەوە)، وە هەر كۆمەڵە فریشتەك كۆدەبنەوەو دەگەنە یەكدی لە نوێژی بەیانیان و نوێژی عەسردا، جا ئەو فریشتەی كە شەو لەلاتان بوون سەردەكەون (بۆ لای خوا) لێیان دەپرسێ: هەرچەندە بە خۆی باشتر حاڵیان دەزانێ، دەفەرموێ: ئەو بەندانەی من چیان دەكرد كە جێتان هێشتن؟ دەڵێن: كە ئێمە چووین بۆ لایان نوێژیان دەكرد، كە هاتینەوەش هەر نوێژیان دەكرد.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٥٢٣٥، وَمُسْلِم: ٢٩٩٦.

(٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٥٣٠، وَمُسْلِم: ١٤٦٤.

**١٣-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزَالُ الْعَبْدُ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَ فِي مُصَلاَّهُ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، وَتَقُولُ الْمَلاَئِكَةُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ حَتَّى يَنْصَرِفَ أَوْ يُحْدِثَ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام بەندە لە نێو نوێژ دایە (یانی: وەك ئەوە وایە كە نوێژ بكات) مادام لە شوێنی نوێژ كردنی بێ، وە چاوەڕوانی نوێژ بكات، وە فریشتەكانیش دەڵێن: خوایە! لێی خۆشبە، خوایە! ڕەحمی پێ بكە، هەتا شوێنەكەی جێ دەهێڵێ، یاخود دەست نوێژی نامێنێ.**

## بڕواهێنان بە كتێبە ئاسمانییەكان

**بڕوامان هەیە بە سەرجەم ئەو كتێبانەی خوای زاناو شارەزا بۆ پێغەمبەرەكانی خۆی ناردوون، صەڵات و سەلام لەسەر بێت، كتێبەكانیش وەك: (التوراة، الإنجيل، الزبور، القرآن)، وە هەموو ئەو كتێبانەی دیكەش كە ناویانمان بۆ باس نەكراون، باشترین ئیمان و بڕوا هەبوونیش بە كتێبیی خوای مەزن، ئەوەیە كە ئیماندار ڕەوشت و ئەخلاقێكی قوڕئانی هەبێت، وە پێویستە بڕوامان هەبێ بەوەی هەرچی تێیاندا بووە لە سەرەتای ناردنیان هەق بووە، دواتر جگە لە قوڕئان هەموو دەستكاریی كراون و شێوێنراون: ئەوەش لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە چەند ئایەتێك فەرموویەتی:** ﴿وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ﴿١٥﴾﴾ الشورى، **هەروەها لەبەر ئەوەی فەرموویەتی:** ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾ الحجر.

---

(١) أَخرَجَهُ مُسْلِم: ١٥٤١.

## ناوی پێغەمبەران و کتێبەکانیان

یەك: تەورات دابەزیوە بۆ پێغەمبەر مووسا ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ .. ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأعراف.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ ﴾ آل عمران.

دوو: ئینجیل دابەزیوە بۆ پێغەمبەر عیسا ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ .. ﴿٤٦﴾ ﴾ المائدة.

سێ: زەبوور دابەزیوە بۆ پێغەمبەر داوود ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾ الإسراء.

چوار: صوحوفەکانی کە دابەزێنراون بۆ ئیبراهیم و مووسا (علیهما السلام)، وەك خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾ الأعلى.

پێنج: جا خوا ﷻ ئاوا پێناسەی قورئانمان بۆ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

## چەند فەرمایشتێك لەبارەی کتێبە ئاسمانییەکان



١٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْزَلَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الزَّبُورِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا وَإِنَّهَا لَلسَّبْعُ مِنَ الْمَثَانِي وَالقُرْآنُ العَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُهُ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، خوای زاڵ و پایەدار نە لە تەورات و، نە لە ئینجیل و، نە لە زەبوورو، نە لە فوڕقاندا (واتە: قوڕئان) وێنەی سووڕەتی (فاتیحە)ی نەناردۆتە خوار، ئەویش بریتیە لە حەوت ئایەتە دووبارە کراوەکان و قوڕئانی مەزن کە پێم بەخشراون (کە بریتیە لە فاتیحە).**

**١٥-** {عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «أُعْطِيتُ مَكَانَ التَّوْرَاةِ السَّبْعَ، وَأُعْطِيتُ مَكَانَ الزَّبُورِ الْمِئِينَ، وَأُعْطِيتُ مَكَانَ الإِنْجِيلِ الْمَثَانِيَ، وَفُضِّلْتُ بِالْمُفَصَّلِ»}[٢].

**واتە: واثیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە شوێنی تەورات سووڕەتی بەقەڕەو ئالی عیمڕان و نیسائـ و مائیدەو ئەنعام و ئەعراف و ئەنفال و تەوبەم پێبەخشراوە، (هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لە "سبع" سووڕەتی فاتیحەیە)، وە لە شوێنی زەبوور ئەو سووڕەتانەم پێبەخشراوە کە ژمارەیان دەگاتە سەد ئایەت، وە لە شوێنی ئینجیل سووڕەتی فاتیحەم پێدراوە، وە فەزڵی زیاترم پێ دراوە بە پێدانی سوڕەتە کورتەکان**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٦٦٧، والتِّرْمِذِي: ٢٨٧٥، وقال: حسن صحيح، والنَّسَائِي في الكبرى: ١١٢٠٥، وأبو يعلى: ٦٤٨٢.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد ١٧٠٢٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

(واتە: قورئان تا دەگاتە سوورەتە کورتەکان جێگەی گشت کتێبەکانی تری ئاسمانی پڕ دەکاتەوە، ئەوەی تریشی کە دەمێنێتەوە لە سوورەتە گچکەکان زیادەیە بەسەر ئەوانەوە).

## بڕواهێنان بە پێغەمبەرانی خوا

١- بڕوامان هەبێ بەوە کە خوای بە بەزەیی بۆ هەموو گەل و ئۆممەتێك پێغەمبەرێك یان زیاتری ناردوون، داوایان لە خەڵك کردوە بە تەنها خوا بپەرستن، وە واز لە پەرستنی غەیری خوا بهێنن: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾النحل.

٢- بڕوا بوون بە هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە ناویان هاتوە لە قورئان و فەرموودەی صەحیح، وەك: (آدَمُ، وَنُوحٌ، وَإِدْرِيسُ، وَإِبْرَاهِيمُ، وَإِسْحَاقُ، وَيَعْقُوبُ، وَدَاوُدُ، وَسُلَيْمَانُ، وَأَيُّوبُ، وَيُوسُفُ، وَمُوسَى، وَهَارُونُ، وَزَكَرِيَّا، وَيَحْيَى، وَعِيسَى، وَإِلْيَاسُ، وَإِسْمَاعِيلُ، وَالْيَسَعُ، وَيُونُسُ، وَهُودٌ، وَصَالِحٌ، وَلُوطٌ، وَشُعَيْبٌ، وَذُو الكِفْلِ، وَخَاتَمُ النَّبِيِّينَ مُحَمَّدٌ)، ئەوانە بیست و پێنج پێغەمبەرن صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر.

وە هەروەها بڕواهێنان بەو پێغەمبەرانەش کە ناویانمان بۆ باس نەکراوە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴿٧٨﴾ ﴾غافر.

٣- بڕواهێنان بەوەی کە موحەممەد ﷺ کۆتا پێغەمبەرەو دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەت، وەك خوا پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾الأحزاب.

**٤- دەبێ بڕوامان بەوە هەبێت ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزانە هەرچی پێیان سپێردراوە لەلایەن خواوە، هەر هەموویان وەك خۆی گەیاندوە، بێ ئەوەی هیچی لێ زیاد، یان کەم بکەن لەلایەن خۆیانەوە، وەك خوای زاناو پەنهانزان دەفەرموێ:** ﴿ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥ ﴾ النحل.

**بە گشتی دەربارەی پێغەمبەران سێ فەرموودە دێنینەوە:**

**١٦-** [عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ نَبِيٍّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ إِلاَّ وقَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا آمَنَ عَلَى مِثْلِهِ الْبَشَرُ، وإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُتِيتُهُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»](١)

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، حەتمەن خوا بەڵگەو موعجیزەی وای پێداوە، کە مرۆڤ (ی حەق ویست) ئیمانی پێ دەهێنێ (بەڵگەکان بای ئەوە بوون ئیمان بێنن، ئەگەر ویستی هیدایەتیان بووبێ)، ئەوەی بە منیش دراوە وەحیە (واتە: قورئانە) خوا بۆی سرووش کردووم، ئومێدەوارم لە ڕۆژی دوایی دا زۆرینەیان شوێنکەوتەی من بن.**

**١٧-** [عنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُعْطِيتُ خَمْساً، لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً»](٢)

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شتم پێدراوە، لە پێش مندا بە هیچ یەکێك لە**

---

(١) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٨٤٧٢، والبُخَارِي: ٤٦٩٦، وَمُسْلِم: ١٥٢.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٣٢٨، وَمُسْلِم: ٥٢١.

**پێغەمبەران نەدراون: بە هۆی ترس خرانە دڵی دوژمنەوە سەرخراوم (بە ئەندازەی) مانگە ڕێیەك، وە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و بە پاککەرەوە، وە هەر پیاوێك لە ئوممەتی من کاتی نوێژ هات با نوێژ (لەسەر زەوی) بکات، وە دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراون کە پێش من بۆ یەك کەس حەڵاڵ نەبوو، وە شەفاعەتم پێدراوە، وە هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەکەی خۆی دەنێردرا، بەڵام من بۆ تێکڕای خەڵکی نێردراوم.**

١٨- [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ، وَالأَنْبِيَاءُ أَوْلاَدُ عَلاَّتٍ، لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ»][1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: من نزیکترینی خەڵکیم بە عیسای کوڕی مەریەم، پێغەمبەران هەموویان بران (لە باببێکن)، وە هیچ پێغەمبەرێك لە نێوان من و ئەودا (عیسا) نیە.**

## بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی

بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی، دیارە ڕۆژی دوایی لەو کاتەوە دەست پێدەکات گشت خەڵك لە گۆڕەکانیان دەردەهێنرێن و دەبردرێن بۆ لێ پرسینەوە، وە پاداشت دانەوەیان لەسەر چاکەکان و سزادانیان لەسەر خراپەکانیان، دەبێ بڕوای تەواومان هەبێ بەوە کە خوای باڵادەست گشت مرۆڤەکان زیندوو دەکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستەی باسمان کرد. بێگومان لەم ڕۆژەدا هەموو خاوەن مافەکان مافەکانیان بە تەواوترین شێوە وەردەگرن، بەهەشتیەکان ڕەوان دەکرێن بۆ بەهەشت و دۆزەخیەکانیش شۆڕ دەکرێنەوە بۆ دۆزەخ، خوا بە بەزەیی خۆی ئێمە لە بەهەشتیان بگێڕێ.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٩٧٥، والبُخَارِي: ٣٢٥٨، وَمُسْلِم: ٢٣٦٥، وأبو داود: ٤٦٧٥.

لەبەر ئەوەش ناونراوە بە ڕۆژی دوایی چونکە ماوەکەی دیاری کراوە، کە کاتی هات ئیتر دواکەوتن و پێشخستنی بۆ نیە، وە هەروەها لە دوای ئەم ڕۆژە ئیدی شەو نیە.

چەند ئایەتێك لەبارەوە:

١)- خوا عزوجل دەربارەی کافران و بێبڕوایان کە گومانیان لە بوونی ڕۆژی دوایی هەیە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾يونس.

٢)- مرۆڤە گومڕاکەرەکان لە ڕۆژی دوایی گوناهی خۆیان و، گوناهی ئەوانەش هەڵدەگرن کە گومڕایان کردوون و لە ڕاستە شەقامی خوا لایانداون، وەك دەفەرموێ: ﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾النحل.

٣)- خوای دادگەر باسی وێنەو دیمەنێکی ڕۆژی دواییمان بۆ دەکات، کە هەر کەسەو کتێبێکی پێیەو دەستی بە گەردنیەوە نووساوە، ئیتر کتێبەکە دەخوێنرێتەوەو پێشان دەدرێ: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ﴾الإسراء.

٤)- خوا (جل شأنه) باسی هاتنی بەندەکانی دەکات بۆ بەردەستی خۆی لە ڕۆژی دوایی، کە هەر ئینسانێك بە تاقی تەنیایەو هیچ کەسێك هاوکارو پشتیوانی لەگەڵ نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾مريم.

٥)- خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خۆشەویست دەفەرموێ: هەم تۆ، هەم ئەوان مردوون و دەبێ بمرن، ئیتر لە ڕۆژی دوایی هەموو کەسێك موناقەشە دەکرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾الزمر.

سەرەتا بە پێویستی دەزانم وەك پلەبەندی، چەند فەرموودەیەك دەربارەی حەقیقەتی دوای مردن کە گۆڕە، بێنین، دواتر هەندێ نیشانەی هاتنی ڕۆژی دوایی، پاشانیش چەند فەرموودەیەك دەربارەی ڕۆژی دوایی (یوم القیامة).

## چەند فەرمایشتێك لەبارەی سزای نێو گۆڕ و هەندێ نیشانەی هاتنی قیامەت

**١٩-** {عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: قَالَ رسُولُ اللهِ ﷺ: «أَيُّهَا النَّاسُ اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَإِنَّ عَذَابَ الْقَبْرِ حَقٌّ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ، چونکە سزای گۆڕ هەقە.**

**٢٠-** {عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ لاَ تَدَافَنُوا، لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»}[٢].

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەبەر ئەوە نەبووایە مردووەکانتان نەنێژن، داوام دەکرد لە خوا سزای گۆڕتان پێ ببیستێ.**

**٢١-** {عَنْ هَانِئٍ مَوْلَى عُثْمَانَ رضي الله عنه قَالَ كَانَ عُثْمَانُ رضي الله عنه إِذَا وَقَفَ عَلَى قَبْرٍ بَكَى حَتَّى يَبُلَّ لِحْيَتَهُ فَقِيلَ لَهُ: تَذْكُرُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ فَلَا تَبْكِي وَتَبْكِي مِنْ هَذَا؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْقَبْرُ أَوَّلُ مَنَازِلِ الْآخِرَةِ، فَإِنْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ مَنْظَرًا قَطُّ إِلَّا وَالْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٤٥٦٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) أَخْرَجَهُ مسلم: ٢٨٦٧.

(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٤٥٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

**واتە: هانیء خزمەتکاری عوسمان ﷺ دەڵێ: عوسمان ﷺ کاتێك لەسەر قەبرێك دەوەستا، ئەوەندە دەگریا تاوەکو ڕیشی تەڕ دەبوو، پێی گوترا: باسی بەهەشت و دۆزەخ کرا نەگریای، ئایا بۆ ئەمە دەگری؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قەبر یەکەم مەنزڵگای بەهەشتە، ئەگەر لێرە ڕزگارت بوو، ئەوەی دوای قەبر دێ ئاسانترە، وە ئەگەر ڕزگارت نەبوو، ئەوەی دوای قەبر دێ قورسترە، (عوسمان ﷺ) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بە خوا هیچ وێنەو دیمەنێکم نەبینیوە، ئیللا گۆڕ لەو سامناك و ترسناکتر بووە.**

**٢٢-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، ثُمَّ يَدْعُو لِنَفْسِهِ بِمَا بَدَا لَهُ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە شایەتمانی تەحیاتی هێنا با (لە دوای خوێندنی تەحیات و پێش سەلامدانەوە) پەنا بگرێ بە خوا لە چوار شت: لە سزای دۆزەخ، لە سزای نێو گۆڕ، لە بەڵاو ئاشووبی مردن، وە لە شەڕو خراپەی مەسیحی دەجال، پاشان بۆ خۆی دەپاڕێتەوە بەوەی بۆی دەگونجێ و دەیەوێ.**

**٢٣-** {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَى مَا فُسِحَ لَهُ فِي قَبْرِهِ، يَقُولُ: دَعُونِي أُبَشِّرْ أَهْلِي، فَيُقَالُ لَهُ: اسْكُنْ»}[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ (ئیماندار دەمرێ و لە گۆڕ دەنێژرێ) کە دەبینێ گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێ (لە خۆشیان دەڵێ:) لێم گەڕێن موژدە بە خزم و کەسم بدەم، پێی دەگوترێ: دان بەخۆتدابگرەو ئارام بە!**

---

(١) أَخْرَجَهُ النَّسَائِيّ: ١٣١٠، (صحيح الجامع): ٤٣٢.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٤٥٨٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

**٢٤-** {عَنْ أَبُو أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ الآيَاتِ طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِها»}[١].

**واته: ئەبو ئەمامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەمین نیشانەی هاتنی قیامەت هەڵاتنی خۆرە، لە خۆرئاواوە.**

**٢٥-** {عَنْ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «تَخْرُجُ رِيحٌ بَيْنَ يَدَي السَّاعَةِ تُقْبَضُ فِيهَا أَرْوَاحُ كُلِّ مُؤْمِنٍ»}[٢].

**واته: عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت بایەك هەڵدەکات ڕووحی هەموو ئیماندارێکی تێدا دەکێشرێ.**

**٢٦-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مكَانَهُ»}[٣].

**واته: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت هەڵناستێ هەتا پیاوێك بە لای گۆڕو قەبری پیاوێکی دیکەدا دەڕوات و دەڵێ: خۆزگە من لە شوێنی ئەو مردووە بوومایە.**

**٢٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ، مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ»}[٤].

**واته: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی (دونیادا) خەڵکانێك لە ئۆممەتم پەیدادەبن، قسەی واتان بۆ دەکەن نە ئێوەو نە باوك باپیرانتان نەیانبیستوە، جا خۆتانیان لێ بپارێزن (واتە: داواتان لێدەکەم گوێیان لـێ مەگرن).**

---

(١) أَخْرَجَهُ الطبراني في (الكبير): ٨٠٢٢، انظر: (السلسلة الصحيحة): ٣٣٠٥.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٥٤٦٣، انظر: (السلسلة الصحيحة): ١٧٨٠.

(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٦٩٨، وَمُسْلِم: ١٥٧.

(٤) أَخْرَجَهُ مسلم: ٦، والحَاكِمُ: ٣٥١، وقال: صحيح على شرطهما.

٢٨- {عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ؟ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ؟»}[1].

**واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا (لە بەردەم دادگای خوای دادگەر) ناجووڵێ تاکو پرسیاری لێ نەکرێ: دەربارەی تەمەنی کە لە چیدا بەڕێ کردوە؟ لە زانیاریەکەی چەندەی کار پێکردوە؟ وە لەو ماڵ و سامانەی کە هەیەتی چۆنی بە دەست هێناوە؟ چۆنیشی خەرج کردوە؟ وە جەستەی لە چیدا پیر کردوەو تەواو کردوە؟!**

٢٩- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ، لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ»}[2].

**واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی دوایی خەڵك لەسەر زەویەکی سپی کۆدەکرێنەوە، وەکو نانێکی سپی وایە، گوناهی لەسەر نەکراوەو، هیچ کەسێك هیچ نیشانەیەکی نیە کە جیای بکاتەوە لە خەڵکی دیکە.**

٣٠- {عَنْ عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَفْضَلَ عِبَادِ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْحَمَّادُونَ، ثُمَّ لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ مَنْ نَاوَأَهُمْ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، حَتَّى يُقَاتِلُونَ الدَّجَّالَ»}[3].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان باشترینی بەندەکانی خوا لە ڕۆژی قیامەت، ئەوانەن**

---

(١) أَخرَجَهُ التِّرمِذِي: ٢٤١٧، وقال: حسن صحيح، وأبو يعلى: ٧٤٣٤، وأبو نعيم في الحلية (٢٣٢/١٠)، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ١٢٦.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٦١٥٦.

(٣) أَخرَجَهُ الطبَرَانِيُّ في الكَبير: ٢٥١٤ انظر: (صحيح الجامع): ١٥٧١.

**کە زۆر حەمدی خوا دەکەن، پاشان بەردەوام تاقمێك لە ئۆممەتەکەم جەنگ دەکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتییان دەکەن لە هاوبەش دانەران، هەتاکو جەنگ لەگەڵ دەجالیش دەکەن.**

**٣١-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيَقْرَأْ: ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ ﴾التكوير»}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بکات، با ئەمە بخوێنێتەوە:** ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ ﴾.

**٣٢-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا أَكْثَرُ الأَنْبِيَاءِ تَبَعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بَابَ الْجَنَّةِ»}[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە ڕۆژی دوایی دا زۆرترین شوێنکەوتەم دەبن، وە من یەکەم کەسم لە دەرگای بەهەشت دەدەم (واتە: داوای کرانەوەی دەکەم).**

## بڕواهێنان بە قەزاو قەدەر

**(القدر) بریتیە لەو شتەی زانیاریی پێش وەختەی لەسەر بێت و قەڵەمی بەسەرداهێنرابێت، لە هەرچی هەیە، بڕوا بوون بە قەدەر پێنج پایەی هەن، ئەوانیش:**

**- بڕوا بوون بەوە خوا زانیاریی پێشوەختەی هەیە بە هەموو شتێك.**

**- بڕوابوون بە نووسرانی هەموو ئەو زانیاریانە پێش دروستکردنی دروستکراوەکان.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٤٩٤١، قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٢) أَخْرَجَهُ مسلم: ٥٠٥.

- بڕوا بوون بەوە خوا چی بوێ هەر ئەوە دەبێت.
- بڕوا بوون بەوە خوا خاوەن و دروستکاری هەموو شتێکە.
- بڕوا بوون بەوە کە قەدەر نهێنی خوای پەنهانزانە، جگە لە زاتی خۆی کەس نایزانێت.

## چەند فەرمایشتێك لەبارەی قەزاو قەدەر

**٢٣-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وأحبُّ إلى اللهِ من الْمُؤْمِنِ الضعيفِ، وفي كُلٍّ خيرٌ. احْرِصْ على ما ينْفعُك، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَلاَ تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فعلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَّرَ اللَّهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕواداری بەهێز چاکترەو لە لای خوا خۆشەویسترە لە بڕواداری بێهێز[2]، وە هەمووشیان هەر خێریان تێدایە، سووربە لەسەر ئەوەی کە سوودت پێ دەگەیەنێت، وە پەنا بە خوا بگرەو یارمەتی لە خوا بخوازەو، خۆت تەنبەڵ و بێهێز مەکە، ئەگەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر وام کردبا، ئاواو ئاوا دەبوو، بەڵکو**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٧٧٧، وَمُسْلِم: ٢٦٦٤.

(٢) کە لێرەدا مەبەست پێی هێزی جەستەیە و، واش پێدەچێ و دەشگونجێ مەبەست پێی هێزی ئیمان بێ، بەڵام فەرمایشتەکە وشەی: (قوی) و (ضعیف)ی بە گشتی هێناوە، کەواتە: دەگونجێ هەم مەبەست پێی هێزی جەستەیی بێ، هەم هێزی عەقڵ، هەم هێزی ئیمان، هەم هێزی ئیرادە، وە بە تەئکید ئەوەی کە بەهێزتربێ لە لای خوای پەروەردگار خۆشەویسترە، بەڵام ئەگەر هێزی جەستە مەبەست بێ، دەبێ، بڵێین: ئەو کەسەی کە جەستەی خۆی بێهێز کردوە لە ئەنجامی کەمتەرخەمیی دا، ئەگەرنا خوا ﷺ ئەگەر کەسێکی بەجەستە و لەش و لارێکی بێهێزەوە خولقاندبێ، ناگونجێ یەکێکی دیکەی لەو خۆشتر بوێ، کە ئەوی بە جەستەیەکی بەهێزەوە خولقاندوە. کەواتە: ئەو بێهێزیی (ضعف)ە، مەبەست پێی لاوازیی جەستەیی یە، واتە: جەستەیەکی لاواز کە لە ئەنجامی کەم تەرخەمییدا لاواز بووە، ئەگەرنا مەبەست پێی هێزی ئیمان، یان هێزی ئیرادەیە، کە ئینسان بۆ خۆی بەدەستیان دێنێ.

بڵـێ: قەدەری خوا ئاوا بوو، خوا ئاوا ئەندازەگیـری کرد بوو، ئەوەی خوا بیەوێ ئەوە دەکات، (ئێمە بۆچی نابێ وا بڵێین؟) چونکە گوتنی: وشەی: (ئەگەر وام کردبا) دەرگای شەیتان دەکاتەوە.

پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرموودەشی وەك هەموو فەرمایشتەکانی دیکەی حیکمەتی لێ دەچۆڕێ!

ئینسان دوای ئەوەی کە شتێك ڕوودەدات، ئەگەر بڵێ: ئەگەر ئاوا بووایە، ئەگەر ئاوا چووبایە، ئەگەر ئاوام نەکردبایە، ئەگەر فڵان کەس وای گوتبایە، ئەو ئەگەرانە هەموو بێ سوودن، چونکە تازە ئاوا کراو ئاوا ڕوویداوە، بۆیە ئەوە تەنیا دەرگا کردنەوەیە بۆ خوتخوتەی شەیتان، بۆ ئەوەی ئینسان دڵی ناڕەحەت بێ، ئەگەرنا هیچ سوودێکی دیکەی تێدانیە، بەڵێ ئینسان دەبێ لە هەڵەو کەم کوڕییەکان دەرس و پەند وەربگرێ، بەڵام ڕابردوو نەهێنێتەوە بۆ ئێستا، وە بیکاتە مایەی داخ و حەسرەت بۆ خۆی و پەکی خۆی پێ بخات.

٣٤- {عَنْ نَافِعٍ قَالَ كَانَ لِابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) صَدِيقٌ مِنْ أَهْلِ الشَّأْمِ يُكَاتِبُهُ فَكَتَبَ إِلَيْهِ مَرَّةً عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَكَلَّمْتَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقَدَرِ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكْتُبَ إِلَيَّ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي أَقْوَامٌ يُكَذِّبُونَ بِالْقَدَرِ»}[1].

واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هاوڕێیەکی هەبوو نووسەری ئەو بوو (شتی بۆ دەنووسی)، جارێك عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بۆی نووسی: پێمان گەیشتوە کە تۆ قسەت کردوە لە شتێك دەربارەی قەدەر، ئاگادارت دەکەین کە هیچ بنووسی لەوبارەوە بۆ من، بەڕاستی من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە دڵنیایی لە ئوممەتی من کۆمەڵێك پەیدادەبن (قەزاو) قەدەر (ی خوا) بە درۆ دەزانن.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٥٦٣٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

**٣٥-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابِقَ الْقَدَرِ، لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ»}[١].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شتێك هەبووایە پێش قەدەری خوا بکەوتایە، ئەوە چاوپیسی پێشی دەکەوتەوە.**

**٣٦-** {عَن أبِي أُمَامَة ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلاَثَةٌ لا يَقْبَلُ اللّهُ مِنْهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفاً وَلاَ عَدْلاً: عَاقٌّ، وَمَنَّانٌ، وَمُكَذِّبٌ بالقَدَرِ»}[٢].

**واته: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ جۆرە کەس هەن خوا لە ڕۆژی دوایی دا هیچ کردەوەیەکی سوننەت و فەڕزیان لێ قبووڵ ناکات، ئەوانیش: ئەو کەسەی ئەزیەتی دایك و باوکی دەدات، وە ئەو کەسەی هەر چاکەیەك دەکات و منەت دەکات بەسەر ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ کردوە، ئەو کەسەش کە قەزاو قەدەر بە درۆ دەزانێ.**

**٣٧-** {قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ لِـي النَّبيّ ﷺ: «جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ»}[٣].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: قەڵەم وشك بووە، (واته: ئەوەی لە قەدەر نوسراوە تازە بڕاوەتەوە) بەوەی هەیەو دەبێ (هەتا ڕۆژی دوایی)!**

**٣٨-** {عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلاًّ مُيَسَّرٌ لِمَا كُتِبَ لَهُ مِنْهَا»}[٤].

---

(١) أَخرَجَهُ التِّرمِذِي: ٢٠٦٢، وقال: حسن صحيح غريب، وصححه الألباني.

(٢) أَخرَجَهُ ابن أبي عاصم في السنة: ٣٢٣، قال المنذري (٢٢٤/٣): إسناده حسن، والطبراني: ٧٥٤٧، انظر: (الصحيحة): ١٧٨٥.

(٣) أَخرَجَهُ البُخَارِي معلقا، كتاب القدر، باب جف القلم على علم الله.

(٤) أَخرَجَهُ أبو نعيم في حلية الأولياء: ج٣، ص٣٠٤، وابن ماجه: ٢١٤٢ انظر: (صحيح الجامع): ١٧٥.

**واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە جوانی داوای دونیا بکەن (بە شێوەیەك نەبێ کە زێدەڕۆیی تێدابێ و، پەنا بۆ حەڕام ببرێ)، چونکە هەموو مرۆڤەکان ئەوەیان بۆ ئاسان دەکرێ و دەبڕێنە ئەو شوێنە کە بۆیان نووسراوە (چ نووسراوە هەر ئەوەیان دەست دەکەوێ).**

**٣٩-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ يَوْمَاً، فَقَالَ: «يَا غُلَامُ! إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظْ اللّهَ تجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سأَلْتَ فَاسْأَلِ اللّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللّه، وَاعْلَمْ أَنّ الأُمّةَ لَوِ اجْتَمَعتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَـيْءٍ لَمْ يَنْفعُوك، إِلاّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللّهُ لَكَ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ، إِلاّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلامُ، وَجَفّتِ الصُّحُفُ»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ سوار بوو بووم (کە منداڵ بووە) فەرمووی: ئەی ڕۆڵە! چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێ، (واتە: دینی خوا بپارێزە، فەرمان و قەدەغەکانی خوا بپارێزە)، خواش دەتپارێزێ، (سنورەکانی) خوا بپارێزە، خوا لە بەرانبەرت دەبینی (واتە: یارمەتیت دەدات)، وە ئەگەر داوات کرد بەس لە خوا داوا بکە، وە ئەگەر یارمەتیت وەرگرت بەس داوای یارمەتی لە خوا بکە[2]، وە بزانە ئەگەر هەموو (مرۆڤەکان) کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن بە**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٦٦٩، والتِّرْمِذِي: ٢٥١٦، وقال: حسن صحيح وَقَالَ الألباني: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) واتە: بۆ ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، ئەگەرنا تۆ بە برادەرێکی خۆت بڵێی: ئەرێ ئەو قەڵەمەم نادەیێ، شتێکی پێ بنووسم، قەیناکە، ئەوەیان داوای هاوکاریەکی لێ بکەی کە بەو دەکرێ، بەڵام ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، بەس لە خوایان داوا بکە، وەك: شیفای نەخۆشی، سەرخستن، ژێر خستن، دەوڵەمەند بوون، هەژار کەوتن، عەزیز بوون، زەلیل بوون تا کۆتایی، چاوەڕوانی ئەوانە لە غەیری خوا مەکە.

شتێك، ئەوە ناتوانن سوودت پێ بگەیەنن مەگەر خوا بۆی نوسیبی[١] وە بزانە کە ئەگەر هەموو مرۆڤەکان کۆببنەوە زیانێکت پێ بگەیەنن بە شتێك، ناتوانن ئەو زیانەت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا بۆی نوسیبی، قەڵەم هەڵگیراون وە (مەرەکەبی) لاپەڕەکانیش وشك بوونەوە (مەبەست ئەوەیە هەموو شتێك لە زانیاریی خوادا هەیەو قەدەر بڕاوەتەوە کەواتە: پشت بە خوا ببەستە).

٤٠- [عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّماوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ»][٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ئەندازەگیری دروستکراوەکانی خۆی بەر لەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات، بە پەنجا هەزار ساڵ هەمووی نووسیوەتەوە، لە کاتێکدا عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو.

ئەگەر خوای پەروەردگار زانیارییەکانی خۆی دەربارەی دروستکراوەکانی نووسیبێتەوە، شتێکی ئاساییە، بەڵام بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، ئێمە نازانین چۆنە؟!

---

(١) یانی: ئەگەر خەڵکێك هاوکاریەکیشی کردی و سوودیان پێ گەیاندی (پێش ئەوەی دەستی وان ببینی، دەستی خوا ببینە، بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەی پێشی وان چاکەکەی لە خوا بزانە، ئەگەر خوا بۆی نەنوسیبای ئەگەر خوا لە دڵی نەنابان، ئەگەر خوا هۆکارەکانی ساز نەکردبا، ئەو شتەت بۆ نەدەبوو).

(٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٦٥٣.

تێبینی:[١] ئەگەر کەسێك بە سادەیی و بێ بیر کردنەوەیەکی قووڵ تەماشای قوڕئان بکات، یان تەماشای ئەم فەرموودانە بکات، وە دڵ و دەروونیشی تەواو نەبێ! ڕەنگە بڵـێ: مادام خوا هەموو شتێکی نووسیبێ، کەواتە: خوا چۆنی نووسیبێ دەبێ هەر وابـێ و پێویست ناکات خۆمان زۆر ماندوو بکەین!

لە ڕاستییدا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەیە، دەزانێ چ دەبێ؟ وە چۆنیش دەبێ؟ وە دوایی ئێمەش ناچار ناکات کە چاکە بکەین، یان خراپە بکەین، بەڵکو بە ئیرادەو ویستی خۆمان کارەکان دەکەین، وە دەبێ دڵنیابین کە زانیاریی خوای دادگەر ئێمە ناچار ناکات چاکە بکەین، یان خراپە بکەین، بە بەڵگەی چی؟ بۆ وێنە:

مامۆستایەك لە سەرەتای ساڵەوە تەماشای قوتابیەکانی دەکات و دەفتەری یاداشتنامەی هەیە، بە پێی ئەگەری خۆی بڵێ: فڵان قوتابی یەکەم دەبێ..! فڵان قوتابی دووەم دەبێ و..! فڵان قوتابی دەرناچێ و دەمێنێتەوە..! فڵان قوتابی لە دەرسێك دەکەوێ و دواییش هەمووی لە دەفتەرەکە تۆمار بکات. دوایی وەك ئەو لە سۆنگەی نووسینی تێبینیەکانی ڕۆژانەی بۆ قوتابییەکان بۆی چوو بوو، وە پێشبینی کردبوو ئاوا دەرچوو کەس بۆی هەیە بڵێ: لەبەر ئەوەی مامۆستا نووسیبووی فڵان کەس یەکەم دەبێ بۆیە یەکەم بوو، فڵان کەسیش لە دەرسێك دەکەوێ بۆیە کەوت؟

بێگومان نەخێر، چونکە مامۆستا دەڵێ: من بە پێی ئەوەی تەماشای حاڵ و وەزعی خۆتانم کرد وامگوت، فڵان کەس هیچ کاتی خۆی بە فیڕۆ

---

(١) ئەم ڕوونکردنەوەم لە (تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز) وەرگرتوە، لە نووسینی: (م. علی باپیر)، کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە ئیعتیمادی زۆرم لەسەر کردوە، پێویست ناکات هەمووجار ئاماژە بە لاپەڕەو بەرگەکانی بکەم، بە تایبەت دوای ئەوەی مۆڵەتی ئەوەم لێوەرگرتوەو دەستکراوەم لەم لایەنە.

نەدەداو خۆی ماندوو دەکرد گوتم ڕەنگە ئەوە یەکەم بێ، ئەوەی دیکەش کە دەمبینی نەیدەخوێندو دەرسەکەی فەرامۆش دەکرد گوتم لەو دەرسە دەکەوێ...! جا ئەوە ئینسان کە زانیارییەکی زۆر کەم و سنوورداری هەیە، دەتوانی ئەو پێشبینیانە بکات. ئەدی خوای پەروەردگار؟! بە تەئکید دەتوانێ و دەزانێ چونکە زانیاریی خوا سنوورێکی نیەو ڕەهایە!!

ئنجا پرسیارێك: ئایا نووسینی مامۆستاکە بووە هۆی ئەوەی فلان قوتابی یەکەم بێ و فلانیش لە دەرسێك بکەوێ؟ بێگومان نەخێر، ئەوەی یەکەم بوو بە هۆی خوێندن و خۆماندوو کردنی خۆی بوو، ئەوەی کە کەوت بە هۆی نەخوێندن و فەرامۆشکردنی دەرسەکە بوو، مامۆستاش کە تەماشای حاڵیانی کرد ئەوە دەرەنجامەی لێ هەڵهێنجا. بێگومان کە خوای پەروەردگار ئێمەی دروست کردوە، پێش ئەوەی ئێمە دروست بکات زانیوویەتی فلان کەس چی دەکات و چۆن دەکات؟

بەڵام زانیوویەتی فلان کەس چی دەکات و چۆن دەکات بە ویست و ئیرادەی ئازادانەی خۆی، نەك خوا ناچاری بکات کە وا بکات، بۆیەش پاداشت و سزا ڕوو لە ئینسان دەکات، بەڵام مەسەلەی نووسین، کە هەیە دەڵێ خوا لە نێوچەوانی نووسیوە، وەك گوتم: پێم وایە ئەم نووسینە تەعبیرێکە، یانی: خوا زانیوویەتی ئەو کەسە ئەو کارە دەکات.

## ئایا ئیمان نوێ دەکرێتەوە؟

٤١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الإِيْمَانَ لَيَخْلَقُ فِي جَوْفِ أَحَدِكُمْ كَمَا يَخْلَقُ الثَّوْبُ الْخَلَقُ، فَاسْأَلُوا اللّهَ أَنْ يُجَدِّدَ الإِيمَانَ فِي قُلُوبِكُمْ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان لە نێو ناخی هەر یەکێك لە ئێوەدا کاڵ و ئاچووخ و کۆن دەبێت، هەروەکو چۆن پۆشاك کاڵ و ئاچووخ و کۆن دەبێتەوە، بۆیە داوا لە خوا بکەن ئیمان نوێ بکاتەوە لە نێو دڵ و دەروونتاندا.**

## خوا ئیمان بەکێ دەبەخشێ؟

٤٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَخْلاَقَكُمْ كَمَا قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ، وَإِنَّ اللَّهَ يُعْطِي الْمَالَ مَنْ يُحِبُّ وَمَنْ لاَ يُحِبُّ، وَلاَ يُعْطِي الإِيمَانَ إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا أَعْطَاهُ الإِيمَانَ»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ڕەوشتی لە نێوان ئێوە دابەش کردوە، هەروەك چۆن ڕزق و ڕۆزی لە نێوانتان دابەش کردوە، خوا ماڵ و سامان دەبەخشێ بە هەر کەسێك کە خۆشی بووێ، یان خۆشی نەوێ، بەڵام ئیمان تەنها دەبەخشێت بەو**

---

(١) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٥. انظر: (الصحيحة): ١٥٨٥.

(٢) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٩٤، وقال: صحيح الإسناد، تعليق الذهبي يي التلخيص: صحيح الإسناد والبَيْهَقِي فِي (شعب) ٥٥٢٤، والطبراني، قال الهيثمي (٩٠/١٠): رجاله رجال الصحيح.

کەسانەی خۆشی دەوێن، کاتێك خوا بەندەیەکی خۆشویست ئیمانی پێ دەبەخشێ.



## پەیوەندی چاکەو خراپە بە ئیمانەوە

٤٣- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ، يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: مَا الإِثْمُ؟ فَقَالَ: «إِذَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ شَيءٌ فَدَعْهُ. قَالَ: فَمَا الإِيْمَانُ؟ قَالَ: إِذَا سَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ، وَسَرَّتْكَ حَسَنَتُكَ، فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ»}[1].

**واتە: ئەبو ئومامە  دەڵێ: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتی: گوناح چییە؟ فەرمووی: هەر شتێکە کە لە دڵتدا بێ و پێی مورتاح نەبی، وازی لێبێنە، (ئەوە دیارە گوناهە)، گوتی: ئەدی ئیمان چییە[2]؟ فەرمووی: ئەگەر بە خراپەکانت ناڕەحەت بووی (پێت ناخۆش بوو)، وە بە چاکەکانت دڵخۆش بووی (پێت خۆش بوو)، ئەوە تۆ ئیمانداری.**

**تێبینی: بێگومان ئەوە تەرازوو و پێوەرێکی زۆر وردە، واتە: ئەگەر کەسێك کارێکی چاکی کرد، وە بەو کارە چاکەی ئەنجامی داوە دڵی خۆشبوو، وە کارێکی خراپ لە دەستی ڕوویدا، گوناهو هەڵەیەکی کرد، پێی دڵناڕەحەت بوو، ئەوە دیارە ئیمانی هەیە، وە ئیمانەکەی وای لێدەکات، بە چاکە دڵخۆش بێ و بە خراپە دڵناخۆش بێ، بەڵام ئەوەی کە ئیمانی نەبێ خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا ﴾[آل عمران: ١٨٨]، واتە: گوناهانیش دەکەن و پێشی دڵخۆشن!**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢٢٢٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح رجاله ثقات.

(٢) واتە: لێرەدا ئەو هاوەڵە بەڕێزە مەبەستی ئەوە بووە کە ئایا لە مەسەلەی چاکەکردن و خراپەکردندا ئیمان چ دەورێك دەبینێ؟ نەك مەبەستی ئەوەبوو بێ کە پێناسەی خودی ئیمانی بۆ بکات.

زۆر کەسی وا هەیە زینا دەکات، قەتڵ دەکات، شەڕاب دەخوات، قومار دەکات، دزیی و ڕێگریی دەکات و خۆشی پێ هەڵدەکێشێ لە مەجلیسان!! وەك ئەوەی شتێکی زۆر گەورەو چاکی ئەنجام دابێ.

بەڵام ئینسانی ئیماندار ئەگەر گوناهێکیشی کرد، شەرم دەکات باسی بکات، شەرم لە خوای پەروەردگارو لە خەڵکیش دەکات، وە خۆی بە خراپ و گوناهبار دەزانێ، وە پێشی ناخۆشە، هەروەها بە چاکەکەشی دڵخۆشە. کەواتە: ئەوەی لە فەرموودەکە هاتوە، مەبەست دڵێکە نەخۆش نەکەوتوە، نەك ئەو دڵەی خوا بە (ران) وەسفی فەرمووە.

## فەرموو: تامی ئیمان بچێژە!

٤٤- {عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيْنَاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً»}[1].

واتە: لە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: تامی ئیمانی چێژتوە، هەر کەسێك ڕازی بێ بەوەی خوا پەروەردگاری بێ، ئیسلام ئایین و بەرنامەی بێ، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری بێت.

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٦٠.

## پێناسەی ئیسلام

(الإِسْلاَمُ: الدُّخُولُ فِي السِّلْمِ، وَالإِسْلاَمُ فِي الشَّرْعِ عَلَى ضَرْبَيْنِ: أَحَدُهُمَا: دُونَ الإِيْمَانِ، وَهُوَ الإعْتِرَافُ باللِّسَان، حَصَلَ مَعَهُ الإعتِقَادُ أَو لَمْ يَحْصُلْ، وَإِيَّاهُ قصِدَ بقَولِهِ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ﴿١٤﴾﴾الحجرات، وَالثَّانِي: فَوْقَ الإِيْمَانِ، وَهُوَ أَنْ يَكُونَ مَعَ الإعْتِرَافِ إعْتِقَادٌ بالقَلْبِ، وَوَفَاءٌ بالفِعْلِ وَاسْتِسْلاَم للهِ ﷻ).

واتە: وشەی: (ئیسلام) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا یانی: ملکەچبوون و چوونە نێو ملکەچییەوە.

بەڵام لە زاراوەی شەرعدا ئیسلام بە دوو واتا بەکاردێ:

یەکەم: لە خوار ئیمانەوەیە کە بریتیە لە دان پێداهێنانی زمان، جا ئیمانی لەگەڵ دابێ، یان لەگەڵ دانەبێ، وەك خوا ﷻ دەربارەی عەرەبە خێلەکییەکان دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا ﴿١٤﴾﴾الحجرات، واتە: عەرەبە خێلەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، پێیان بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: مسوڵمان بووین و ملکەچبووین بە ڕواڵەت.

دووەم: لە قورئاندا ئیسلام لە سەرووی ئیمانەوەش بەکارهاتوە، ئەویش ئەوەیە کە سەرەڕای دانپێداهێنانی زمان، بڕواهێنانی دڵی لەگەڵدابێ، وە هەروەها وەفاکردن بەو پەیمانە بە کردەوە، وە ملکەچبوون بۆ خوا. کەواتە: وشەی (ئیسلام) لە قورئاندا بە هەردوو واتاکە بەکارهاتوە، هەم بە مانای مسوڵمان بوونێکی ڕواڵەتی، وە هەم بە مانای مسوڵمان بوونێکی ڕاستەقینەش. وە پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ زۆر بە کورتی: دەربارەی کۆی ئیسلام ئەوەی لێ گێڕدراوەتەوە:

**٤٥-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قال رَسْول اللّهِ ﷺ: «بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّه، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ»}[1].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا، وە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە بەرپاکردنی نوێژو، دانی زەکات و، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان، وە حەجی ماڵی خوا.**

**لێرەدا هەندێك لە مسوڵمانان وا دەزانن کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە: هەر کەسێك ئەو پێنج شتەی ئەنجامدان، مانای وایە مسوڵمانەتی تەواو کردوە، بەڵام پێویستە هەموو لایەکمان بزانین کە مەبەست لە ئیسلام لێرەدا مسوڵمانەتی شەخصییەو مرۆڤ ئەم پێنجانە لە خۆیدا ئەنجامبدا، ئنجا وەك شەخص دەبێتە مسوڵمان، شایەتمان هێنان کە ئیمان و عەقیدە دەگرێتەوە نێوخۆی، وە بەرپاکردنی پێنج فەڕزەی نوێژ، زەکات دان، ڕۆژووگرتن، حەج کردن، ئەوانە پێنج درووشم و نیشانەن بۆ ئەوەی کە ئێمە بزانین ئەو شەخصە مسوڵمانە یان نا؟**

**وە تەماشا دەکەین: ئەگەر شایەتمانی هێنا دەزانین کە ئەوە تەعبیر لە ئیمان و عەقیدەی مسوڵمانەتی خۆی دەکات، وە ئەگەر نوێژی کرد دەزانین کە ئەوە بەندایەتی بۆ خوای خۆی دەکات، وە ئەگەر زەکاتی داو ڕۆژووی گرت و حەجی کرد، دەزانین کە ئەو کەسە کەسێکی پابەندە بە ئیسلامەتییەوە، بەڵام ئیسلامەتی بە تەئکید لەو پێنجانەدا کورت هەڵنەهاتوە.**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٨، وَمُسْلِم: ١٦.

## دەربارەی: گوتنی وشەی شایەتمان

شایەتمان هێنان دوو بەشی لێك جیانەکراوەن، یەکیان بەبێ ئەوی دیکە تەواو نابێت، ئەوانیش:

بەشی یەکەم: باسی مافی خوای پەروەردگار دەکات لە یەکتاپەرستی، واتە: لە پەرستندا بە تەنیا عیبادەتی بۆ دەکرێ و، هاوبەشی بۆ پەیدا ناکرێ لەبەر ئەوەی هاوبەشی نین لە ئەسڵدا.

بەشی دووەم: باسی مافی پێغەمبەرە ﷺ لە پێغەمبەرایەتی و تەنیا شوێنکەوتنیەتی، چونکە دەبێ دڵنیابین هیچ کردەوەیەکمان لـێ قبووڵ ناکرێ بێ ئەوەی شوێن پێی پێغەمبەری خوامان ﷺ هەڵگرتبێ و بە پێی سوننەت کارەکەمان کردبێ، لەبەر ئەوەی خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴿٨٠﴾ ﴾النساء.

هەر کەسێك کە دەڵێ: (لاَ إلَهَ إلاَّ اللّه، مُحَمَّد رَسُولُ اللّهِ) واتە: لە ناخی دڵمەوە قەناعەتم وایەو بە زمانیش دەری دەبڕم و بە ئەندامەکانی جەستەشم دەیسەلمێنم و دان دەنێم بەوە کە جگە لە اللّه ی بەرزو بێ هاوتا هیچ پەرستراوێکی دیکەی بە هەق نیە، چونکە پەرستراوی بە ناهەق زۆر زۆرن، وەك ئێمە دەبینین: کەسانێك هەن: خۆرو مانگ و ئەستێرەو داروبەردو شەخص و جۆرەها ئاژەڵ دەپەرستن. بەڵام ئێمەی مسوڵمان غەیری پەروەردگاری هەق، ئەوانی دیکە هیچی بە خواو پەرستراو نازانین، لەبەر ئەوەی تاك و بە پاکگیراوە، دروستکارو ڕۆزیدەرە، هەڵسوڕێنەری گشت کاروباری دروستکراوەکانیەتی لە دونیاو دوارِۆژدا، مادام خوایەك وابێ دەبێ شایستەی پەرستن بێت، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ ﴾لقمان.

## مەرجەکانی قبووڵ بوونی شایەتمان

دیاره هەر کەسێك گوتی: (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّه، مُحَمَّد رَسُولُ اللّه) مانای وانیه حیسابی له دونیا تەواو بووەو له قیامەت شایان و شایستەی چوونه به هەشت بووه! وه بۆ ئەوەی دڵنیابین هەر بەوەنده بەهەشت مسۆگەر ناکەین، با سەرنجی ئەو بەسەرهاته بدەین که ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خوای لـێ بێ، له کتێبه ڕاست و دروستەکەی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە:

(قَالَ الإِمَام البُخَارِيُّ: "بَاب مَا جَاءَ فِي الْجَنَائِزِ وَمَنْ كَانَ آخِرُ كَلامِهِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ"، وَقِيلَ لِوَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ: أَلَيْسَ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنْ لَيْسَ مِفْتَاحٌ إِلاَّ لَهُ أَسْنَانٌ، فَإِنْ جِئْتَ بِمِفْتَاحٍ لَهُ أَسْنَانٌ فُتِحَ لَكَ، وَإِلاَّ لَمْ يُفْتَحْ لَكَ)

واته: پێشەوا بوخاریی دەربارەی ئەوە که هەر کەسێك که کۆتا وشەی (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّه) بێ پێش مردن دەچێته بەهەشت، دەڵێ: به (وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ) گوترا: ئایا (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّه) کلیلی بەهەشت نیه؟ گوتی: با، بەڵام هیچ کلیلێك نیه ددانی نەبێ، جا ئەگەر هاتی و کلیلێکت پێ بوو ددانی هەبوو ئەوه بۆت دەکرێتەوە، ئەگەرنا بۆت ناکرێتەوە.

## ئایا ددانەکانی ئەم کلیله چین؟

**یەکەم: هەبوونی زانیاریی بەم وشەیە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:**

٤٦- {عَنْ عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ»}[1].

---

(١) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٤٦٤، وَمُسْلِم: ٢٦، وابن حبان: ٢٠١.

واتە: عوسمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مردو زانی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (اللّه) دەچێتە بەهەشت.

دووەم: یەقین و دامەزراوی: یەقینی تەواوت هەبێ ئەم وشەیە چی دەگەیەنێ، بێ هیچ گومان و دوو دڵییەك، کە پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

٤٧- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللّهِ لاَ يَلْقَى اللّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فِيهِمَا، إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شایەدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە (اللّه)و من پێغەمبەری خودام، هەر بەندەیەك بەو حاڵەوە بچێتەوە خزمەت خواو گومانیشی نەبێ حەتمەن دەچێتە بەهەشتەوە.

سێیەم: قبووڵ کردن: دوای زانست و یەقین دەبێ ئەو زانیارییە جێی دڵنیاییە شوێنەواری خۆی هەبێ بەوەی کە هەر شتێك ئەو وشە دەیخوازێ بەرجەستە بکرێ بە زمان و دڵ.

چوارەم: پابەند بوون: پابەند بوون بە خوا بەیەککرتنەوە سەنگی مەحەکەو سەلماندنی ئیمانی کردارییە، ئەمەش بە شوێنکەوتنی حەڵاڵ و وازهێنان لە حەرام.

پێنجەم: ڕاستگۆیی: ڕاستگۆیی لە گوفتارو کرداردا، بەرجەستە کردنی تەواوی ئەوەی ئەم وشەیە دەیخوازێ.

شەشەم: خۆشویستن: مسوڵمان ئەو وشە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه)ی خۆشدەوێ، پێی خۆشە کار بە واتاکەی بکات و ئەوانەی کاری پێدەکەن خۆشی دەوێن.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٤٤٧، وَمُسْلِم: ٢٧.

حەوتەم: نیاز پاکی: مەبەست لە دەربڕینی ئەم وشەیە تەنیا ڕەزامەندی خوا بێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:

٤٨- {عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ النَّبِيّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ: لا إلهَ إلاَّ اللّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ»}[1].

واتە: عیتبانی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ئەو کەسەی لەسەر ئاگر حەڕام کردوە کە دەڵێ: (لاَ إلَهَ إلاَّ اللّه) مەبەستی پێ ڕەزامەندی خوایە.

## دەربارەی: ئەنجامدانی نوێژەکان

نــــوێـــــژ: کە یەکێکە لە پایەکانی مسوڵمانەتیی، بەبێ دەستنوێژ ناتوانین بە هیچ جۆرێك لێی بدوێین، وەك خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ ... ﴿٦﴾﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ کردن ... دەستنوێژ بگرن..

چونکە مەرجی دروست بوون و تەواوی نوێژ، بریتیە لە دەستنوێژێکی ڕێك و پێك، جا ئێمە سەرەتا کەمێك باسی ئەم مەرجەی نوێژ دەکەین کە لە کتێبە فیقهیەکان بەشێکی لە پاك و خاوێنی (الطهارة) هاتوون و، چەند فەرموودەیەکی لەبارەوە دێنێنەوە، ئنجا باسی نوێژ دەکەین:

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٤١٥، وَمُسْلِم: ٣٣.

## دەربارەی: پاك و خاوێنی

لە ئەسڵی زماندا:

(الطَّهَارَةُ: النَّظَافَةُ وَالنَّزَاهَةُ عَنِ الأَنْجَاسِ وَالأَدْنَاسِ)، واته: (طهَارَة) بە مانای پاك و خاوێنی و دوورگرتن دێ لە چڵکیی و پیسیەکان.

لە زاراوی شەرعدا:

(الطَّهَارَةُ: ارْتِفَاعُ الْحَدَثِ وَمَا فِي مَعْنَاهُ وَزَوَال النَّجَسِ، فَالطَّهَارَةُ أَعَمُّ مِنَ الْغُسْل)، واته: (طهَارَة) بریتیە لە لابردن و هەڵگرتنی بێ دەستنوێژیی و، لابردنی هەموو پیسیەکانیش دەگرێتە خۆی، هەروەها وشەی (طهَارَة) گشتگیرترە لە خۆشوشتن.

پاك و خاوێنی هەرچەندە شتێکی پەسندو باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانێکی خوای پەروەردگارەو، وە پایەو پاداشتێکی زۆری بۆ هەر کەسێك داناوە کە ئەم سیفەتەی لە خۆیدا بێنێتە دی و، خوای پەروەردگار ئەوانەی بە خۆشەویستی خۆی گێڕاوە کە حەز بە پاك و خاوێنی دەکەن و خۆشیان بە پاکی ڕادەگرن، دیارە لێرەدا باسی هاوەڵانی بەڕێز دەکات لە مزگەوتدا، دەفەرموێ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ۝١٠٨﴾ التوبة، واته: لەم مزگەوتەدا پیاوانێکی وا هەن کە حەز لە پاك و خاوێنی دەکەن و خۆشیان (هەم ڕووالەت و پۆشاك و بەرگیان، هەم سینەو دڵ و دەروونیان) پاك و خاوێن ڕادەگرن، وە بێگومان خوا خۆ پاکڕاگرانی خۆشدەوێ.

لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة، واته: بێگومان خوا تۆبەکارانی خۆشدەوێن، وە خۆ پاککەرەوانی

خۆشدەوێن، واتە: ئەوانەی خۆشدەوێن کە پەشێمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، دوای ئەوەی گوناهێکیان ئەنجام داوە، ئەوانەشی خۆشدەوێن کە خۆیان پاکدەکەنەوە، چ لەڕووی مەعنەوییەوە، چ لەڕووی ماددییەوە، وە هیچ شتێك ناکەن لەڕووی شەرعییەوە بە پیس و خراپ دانرابێ.

بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین، ئەهلی عیرفان و تەزکیەی نەفس قووڵتر لە مانای پاکی و تەهارە دواون، بۆ وێنە: ئەبو حامدی غەزالی دەڵێ: پاکی دوو بەشە: (طهارة القلب) پاکی و پاکردنەوەی دڵ و دەروون، وە (طهارة البدن) پاکی و پاکردنەوەی لاشە.

بێگومان، زۆر گرنگ و پێویستە بەر لە پاك کردنەوەی پۆشاك و لاشەمان، دڵ و دەروونمان پاك بکەینەوە لە هەر شتێك کە ناخە بە فیترەت پاکەکەمان پیس دەکەن، وەك: ئیرەیی و، حەسوودی، ڕق و کینە، یەکتر بوغزاندن، خۆپێگەورەیی و خۆپێ پەسندیی، بە پێچەوانەوە دڵمان بکەینە شوێنی گشت سیفەتە جوانەکانی وەك خۆشەویستنی خەڵك و خاکیی بوون و ... هتد.

ئا بەم پاکیی و ڕواڵەتیی و پەنهانەوە بچینە خزمەت خوای تعالی جل جلالە.

ئا لێرەوە تێدەگەین، کە دەست نوێژ بریتیە لە شۆردنی دڵ و دەروون لە هەر چی سیفەتێکی پەست کە تێیدا کۆبۆتەوە!

## دەربارەی: دەستنوێژ گرتن

٤٩- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلاَ صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ»}(١).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نوێژ قبوڵ ناکرێ (لە خاوەنەکەی) بەبێ دەستنوێژ، هەروەها خێریش (قبوڵ ناکرێ) لە ماڵێك کە لە غەنیمەت، یان موڵکی گشتی مسوڵمان بە ناهەق بەدەستهاتووەو دزراوە.**

٥٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ وُضُوءَ لَهُ، وَلاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَيْهِ»}(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ دروست نیە بۆ کەسێك کە دەستنوێژی نەبێ، وە دەستنوێژ بۆ کەسێك نیە کە ناوی خوای بەرزی لەسەر نەهێنێ (لە کاتی دەستنوێژ گرتن، مەگەر لەبیری بچێ).**

٥١- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ»}(٣).

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بە جوانی هەڵبگرێ، گوناهەکانی لە جەستەی دەچنە دەر، هەتاکو لە ژێر نینۆکی پەنجەکانیشی گوناهەکانی دەچنە دەر.**

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٥٥٧.
(٢) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ١٠١، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٤٧٦، وَمُسْلِم: ٢٤٥.

**٥٢-** «مَنْ تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ»}[١].

**واتە: هەر كەسێك دەستنوێژ بگرێ، وەك چۆن فەرمانی پێكراوەو، نوێژ بكات وەك چۆن فەرمانی پێكراوە، خوا لە گوناهەكانی ڕابردووی خۆش دەبێ.**

**٥٣-** {عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ رَأَى أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَتَوَضَّأُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ حَتَّى كَادَ يَبْلُغُ الْمَنْكِبَيْنِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ حَتَّى رَفَعَ إِلَى السَّاقَيْنِ ثُمَّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أُمَّتِي يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ»}[٢].

**واتە: نەعیمی كوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە كە ئەبو هوڕەیڕەی ﷺ بینیوە كە دەستنوێژی هەڵگرتوە، (دەڵێ:) دەم و چاوی شۆرد، دواتر دەستی شۆرد تاوەكو خەریك بوو بگاتە شانەكانی، پاشان قاچی شۆرد زۆر زیاتر لە سەرووی گوێزینگەكانی، پاشان فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: بێگومان لە ڕۆژی دوایی دا ئۆممەتەكەم كاتێك دێن ڕووخسارو دەست و پێیان سپین بە هۆی شوێنەواری دەستنوێژ گرتنەوە، (ئەبو هوڕەیڕە دەڵێ:) جا هەر كەسێك لە ئێوە دەتوانێ شوێنی دەستنوێژ شوشتنی زۆرتر بشوات با ئەو كارە بكات.**

**٥٤-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِمَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ النَّسَائِي ١٤٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٣٦، وَمُسْلِم: ٢٤٦، وابن حبان: ١٠٤٩.

(٣) أَخْرَجَهُ مالك: ٣٨٤، وأَحْمَد: ٧٢٠٨، وَمُسْلِم: ٢٥١

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەواڵتان پێ بدەم بە شتێك کە گوناهەکانی پێ دەسڕدرێتەوەو، پلەکانی پێ بەرز دەبنەوە؟ لە کاتێکدا کە سەرماو نارەحەتییە دەستنوێژ بە جوانی و باشی هەڵبگری، وە زۆر بەرەو مزگەوت هەنگاوبنێی، وە لە دوای نوێژ چاوەڕێی نوێژی دیکە بکەی، ئا ئەوە (رباط)ە، ئا ئەوە (رباط)ە، ئا ئەوە (رباط)ە، (واتە: ئەوە ئەو خێرەیە کە وەك ئێشکگری وایە لە سوپای حەقیقی ئیسلام).

٥٥- {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عامرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَد يتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضوءَ، وَيُصَلِّي رَكْعتَيْنِ يُقْبِلُ بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ علَيْهِما، إلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»}[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە بە جوانی دەستنوێژ بگرێ و دوایی دوو ڕکات نوێژ بکات، ڕووی لە نوێژەکەی بێ و بە دڵ ئەنجامی بدات، حەتمەن بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، (یانی: دەچێتە بەهەشتەوە).

٥٦- {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ عَنِ النَّبيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ أَوْ فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ اللّهِ وَرَسُولُه، إلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»}[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە بە جوانیی و ڕێك و پێکی دەستنوێژ بگرێ و، پاشان بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ اللّهِ وَرَسُولُه) ئەوە بێگومان

---

(١) أَخْرَجَهُ أبو داود: ٩٠٦، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ٢٢٧.

(٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٣٤، وزَادَ التِّرْمِذِي بَعدَ ذِكْر الشَّهَادَة: «اللَّهُمَّ! اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِيْنَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ».

هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، لە کامەیان بیەوێ بە ئارەزووی خۆی دەچێتە ژوورەوە.

٥٧- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريّ ﷺ عن النَّبيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَقَالَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، كُتِبَ فِي رِقٍّ، ثُمَّ طُبِعَ بِطَابِعٍ فَلَمْ يُكْسَر إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»}[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ و پاشان بڵێ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ اسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) ئەوە بۆی لەسەر لەوحێك دەنووسرێ، ئنجا مۆرێکی لەسەر دەردێ و ئیدی ناشکێنرێ تا ڕۆژی قیامەت.

(کەواتە: پاداشتەکەی هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ چەندە؟ وە لە ڕۆژی دواییش ئەو کەسە زۆر دڵخۆش دەبێ بەو پاداشتەی کە بە هۆی ئەم زیکرەوە بۆی نووسراوە).

## بانگدان بۆ ئەنجامدانی نوێژ

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (فصلت)دا لە بارەی کەسێک کە بانگەواز دەکات بۆ ڕێی ئیسلام و خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە بۆ نوێژ کردن فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: کێ وتەی چاکترو بەجێترە لەو کەسەی (خەڵک) بانگ دەکات بۆ لای خوا، وە کاری چاک دەکات و دەڵێ من مسوڵمانم.

---

(١) أخرَجَهُ الحَاكِمُ: ٢٠٧٢، وقال: صحيح على شرط مسلم، والطبراني في الأوسط: ١٤٥٥، انظر: (الصحيحة): ٢٣٣٣.

## چۆنیەتی بانگدان

اللّهُ أَكْبَرُ      اللّهُ أَكْبَر
اللّهُ أَكْبَرُ      اللّهُ أَكْبَر

أَشْــــهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّــهُ      أَشْــــهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّــهُ
أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ      أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ
حَــــيَّ عَــلَـى الصَّــــلاَةِ      حَــــيَّ عَــلَـى الصَّــــلاَةِ
حَــــيَّ عَــلَـى الْفَــــلاَحِ      حَــــيَّ عَــلَـى الْفَــــلاَحِ

اللّهُ أَكْبَرُ      اللّهُ أَكْبَر
لاَ إِلَـــــهَ إِلاَّ اللّـــهُ

## مانای وشەکانی بانگ

دیارە وشەکانی بانگ، مانای زۆر گەورەو گرنگیان هەیە! وە درووشمی هەرە گەورەی ئیسلام و مسوڵمانانن!

خوای بەرز، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆڕایی و بێ حیکمەت نیە، ئەو وشە گەورانەیان کردوە بە درووشم و بانگ بۆ مسوڵمانان، کە ئەوە تایبەتە بە مسوڵمانانەوە، هیچ خاوەن دین و بەرنامەیەکی دیکە شتی وایان نیە، ڕۆژێ پێنج جاران ئەو وشە گەورانە بگوترێن، وە شیعاری کۆکردنەوەی مسوڵمانان بن، بۆ شتێک کە گەورەترین شتە لە دینەکەیاندا، کە ئەویش نوێژە، مانای وشەکان بەو شێوەیە:

(اللّــهُ أَكْـبَرُ): واتە: خوا گەورەترە، بەو واتایە نا لە فڵان شت و لە فڵان شت! خوا گەورەترە بە ڕەهایی هەرچی تۆ بە دڵ و مێشکت دادێ، خوا گەورەترە، بە هەموو شێوەکانی گەورەیی، خوا گەورەترە بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، نەک گەورەییەکت بە مێشکی دابێ کە لەگەڵ بێ وێنەیی خوای پەروەردگاردا نەگونجێ، چوار جار ئەوە دووبارە دەبێتەوە.

(أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ): واتە: شایەدیی دەدەم کە جگە لە اللّه هیچ پەرستراوی بە هەق نین

(أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ): واتە: وە شایەدی دەدەم کە موحەممەد ﷺ ڕەوانە کراوی خوایە

(حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ): واتە: وەرن بۆ نوێژ کردن

(حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ): واتە: وەرن بۆ سەرفرازیی

(اللّهُ أَكْبَرُ): واتە: خوا گەورەترە

(لَاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ): واتە: هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە (اللّه)

### چۆنیەتی قامەتکردن

اللّهُ أَكْبَرُ اللّهُ أَكْبَر

أَشْــهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّـــه أَشْــهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّــه

حَـــيَّ عَــلَـى الصَّــــلاَة حَـــيَّ عَــلَـى الْفَـــلاَح

قَــدْ قَـــامَـتِ الصَّـــلاَة قَــدْ قَـــامَـتِ الصَّـــلاَة

اللّهُ أَكْبَر اللّهُ أَكْبَر

لاَ إِلَــــــهَ إِلاَّ اللّـــه

پێشتر واتای (بانگ)مان شیکردەوە بە کوردی، وشەکانی قامەتیش هەمان وشەی بانگن، جگە لە ڕستەی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ)، ئەویش واتە: نوێژ دەستپێکردن نزیکە، نوێژ دەستپێکردن نزیکە.

## دوعای نێوان بانگ و قامەت

٥٨- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يُرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ»}[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە.**

٥٩- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[2].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کاتێ گوێی لە بانگ دەبێ، لەو کاتەدا بڵێ: خوایە! ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە، وە ئەم نوێژە دامەزراوە، ببەخشە بە موحەممەد ﷺ پلەی وەسیلە و (فَضِيلَة)، وە بیبە بۆ ئەو شوێنە سوپاسکراوەی کە پەیمانت پێداوە، حەتمەن لە ڕۆژی دوایی تکاو شەفاعەتی منی بەردەکەوێ.**



---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٥٢١، وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة): ٦٧١.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦١٤، وأبو داود: ٥٢٩، والتِّرْمِذِي: ٢١١، وابن ماجه: ٧٢٢.

## نوێژە فەرزەکان

دەربارەی ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان لە کاتی دیاریکراوی خۆیان و پارێزگاری کردنیان، وە پاداشت و فەزڵی زۆر لەسەر باش ئەنجامدانیان، خوا لە قورئاندا لە چەندین ئایەتی پیرۆز باسی فەرمووە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ أُولَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾﴾ النساء.

واتە: وە بەجێهێنەرانی نوێژو زەکات دەران و بڕواداران بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئا ئەوانە لە داهاتوویەکی نیزیکدا پێیان دەبەخشین پاداشتێکی زۆر گەورە.

وە هەروەها دەربارەی پارێزگاری لێکردن و ئەنجامدانیشیان لە کاتی دیاری کراوی خۆیاندا، خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: ﴿فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾﴾ النساء، واتە: نوێژەکانتان بە ڕێک و پێکی ئەنجام بدەن، چونکە بێگومان نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزێکەو کاتێکی دیاری کراوی هەیە کە دەبێ تێیدا ئەنجام بدرێ.

هەروەها یەکێک لە حیکمەتەکانی فەرز کرانی نوێژو هۆکاری قبووڵ بوونی نوێژ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴿٤٥﴾﴾ العنكبوت، واتە: نوێژەکانتان بکەن (لە کاتی دیاری کراوی خۆیداو) چونکە بێگومان نوێژ خاوەنەکەی دوور دەخاتەوە لە کاری خراپ و ناپەسند.

کەواتە: دەبێ دڵنیابین تەنیا ئەو نوێژانە وەردەگیرێن و پاداشتیان لەسەر دەدرێتەوە کە وا دەکەن خاوەنەکانیان خۆیان بگرنەوەو لە ئەنجامدانی هەر چیەکی خوا پێی ناخۆشە.

٦٠- {عَنْ عَبْد اللّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ: أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «بِرُّ الوَالِدَيْنِ»، قَال: قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «الجِهادُ فِي سبيلِ اللّهِ»}[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: چ کردەوەیەک لە هەموو کردەوەکان چاکترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ دایک و باب، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خوادا.**

٦١- {عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّه ﷺ كَانَ يَقُولُ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ»}[٢].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پێنج نوێژە فەڕزەکان، نوێژی هەینی بۆ نوێژی هەینی، وە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، دەبنە کەفارەتی ئەو گوناهانەی لە نێوانیاندا دەکرێ، ئەگەر مرۆڤ خۆی دوورگرتبێ لە ئەنجامدانی گوناهی گەورە.**

٦٢- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ رَاحَ إِلَى مَسْجِدِ الْجَمَاعَةِ، فَخُطْوَةٌ تَمْحُو سَيِّئَةً، وَخُطْوَةٌ تُكْتَبُ لَهُ حَسَنَةٌ، ذَاهِبًا وَرَاجِعًا»}[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بچێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، بە هەر هەنگاوێکی گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە، وە بە هەر هەنگاوێکی کە دەچێ و دێتەوە چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٣٩٩٨، والبُخَارِي: ٥٠٤، وَمُسْلِم: ٨٥، والنَّسَائِي: ٦١٠، وابن حبان: ١٤٧٧.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٣٣.

(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٦٥٩٩، وابن حبان: ٢٠٣٩، قَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

٦٣- {عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ ﵁ عَنِ النَّبيِّ ﷺ قَالَ: «بَشِّـرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[١].

**واتە: بورەیدەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: موژدە بدە بەو کەسانەی کە لە تاریکایی شەوان بەرەو مزگەوت دەڕۆن بە ڕووناکیی و ڕۆشنایەکی تەواو لە ڕۆژی دوایی کە پێیان دەبەخشرێ.**

٦٤- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، عَنِ النَّبيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ مَشَى فِي ظُلْمَةِ اللَّيلِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، آتَاهُ اللّهُ نُوراً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[٢].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە تاریکایی شەودا بەرەو مزگەوت بچێ، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دوایی نورو ڕووناکی پێ دەبەخشێ.**

٦٥- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَوَاتِ عِنْدَ اللّهِ، صَلاَةُ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي جَمَاعَةٍ»}[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان باشترینی نوێژەکان لە لای خوا، ئەنجامدانی نوێژی بەیانیە بە کۆمەڵ لە ڕۆژی هەیندا.**

٦٦- {عَنْ رَافِعِ بْنِ خُدَيْجٍ ﵁، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِصَلاَةِ الْمُنَافِقِ، أَنْ يُؤَخِّرَ الْعَصْرَ حَتَّى كَانَتِ الشَّمْسُ كَثَرْبِ الْبَقَرَةِ صَلاَّهَا»}[٤].

---

(١) أَخرَجَهُ أبو داود: ٥٦١، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أَخرَجَهُ ابن أبي شيبة: ٦٤٣٨، أَخرَجَهُ الطبراني كما في مجمع الزوائد (٢/٣٠) قال الهيثمي: رجاله ثقات، وابن حبان: ٢٠٤٦، والبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٢٩٠٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح بشواهده.

(٣) أَخرَجَهُ البَيْهَقِي في (شعب الإيمان): ٣٠٤٥، انظر: (الصحيحة): ١٥٦٦.

(٤) أَخرَجَهُ الدارقطني (٢٥٢/١)، والحَاكِمُ: ٧٠٢، انظر: (صحيح الجامع): ٢٦٠٦.

**واتە: ڕافیعی کوڕی خودەیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێبدەم لەبارەی نوێژی دوو ڕووەوە؟ ئەوەیە کە نوێژی عەصر دوابخات تا ئەو کاتەی خۆر وەکو بەزی ورگی مانگای لێدێ (کە بەزێکی زەردی تەنکە، مەبەستی ئەوەیە کەسی مونافیق نوێژی عەصر تاخیر دەکات تا ڕۆژ زەرد دەبێت و کاتی عەصر زۆر تەنک دەبێتەوەو خەریکە مەغریب دابێت)، ئنجا نوێژەکەی دەکات، (دیارە کە ئەو کەسە بە ئەنقەست و بە بێ هۆ ئەمە دەکات، بۆیە دەیکات تا خەڵک نەڵێن نوێژنەکەرە).**

**٦٧-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ ما يُحَاسَبُ بِه الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيامَةِ صلاتُه، فإنْ وُجِدتْ تامَّةً كُتِبَتْ تامَّة، وإنْ كان انتَقص مِنْها شَيْءٌ، قالَ: انْظُرُوا هَلْ تَجِدُون لَهُ مِنْ تطَوُّعٍ يُكَمِّلُ لَهُ ما ضَيَّعَ مِنْ فَرِيضَةٍ مِنْ تَطَوُّعِه، ثُمَّ سائِرُ الأَعْمَالِ تَجْرِي عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شت کە مرۆڤ لێپرسینەوەی لەسەر لێدەکرێ لە ڕۆژی قیامەت نوێژەکانیەتی، ئەگەر بینرا نوێژەکانی تەواون، ئەوە بە تەواوی بۆی دەنووسرێن، وە ئەگەر کەم و کوڕیان هەبن، (خوای پەروەردگار لە فریشتەکان) دەفەرموێ: تەماشا بکەن، بزانن ئایا نوێژ سوننەتی هەیە، بۆی تەواو بکرێ لەوەی لە دەستی داوە لە نوێژی فەڕز (لە کەموکوڕی)، پاشان سەرجەم کردەوەکانی لەسەر ئەوە دەڕۆن (واتە: زەکات، ڕۆژوو.. هتد).**

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێم:

**با نوێژەکانمان تەنها چەند جووڵەیەکی لاشە نەبن و بەس، بەڵکو با دڵمانیان پێوە پابەندو پەیوەست بکەین، هەڵبەت دڵ پێوە پابەند بوون و پەیوەست کردنیش ئەوەیە: بە پاکی ڕایبگرین و پیسی نەکەین بە گوناهە پەنهانەکانی وەک پێشتر ئاماژەم پێدان..**

---

(١) أَخْرَجَهُ النَّسَائِي، وأبو داود: ٨٦٤، صحيح بِطُرقِهِ وشَواهِدِه.

## دەربارەی: دروستکردنی مزگەوت

**خوای باڵادەست دەربارەی ئەوانەی مزگەوت کە ماڵێکە لە ماڵەکانی خوا لەسەر زەوی ئاوەدان دەکەنەوەو، دروستی دەکردن بۆ نوێژ تێداکردنی، فەرموویەتی:** ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾﴾ التوبة، **واتە: بێگومان کەسێک مزگەوت کە ماڵی خوایە ئاوەدانی دەکاتەوەو بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ و، نوێژ ئەنجام بداو زەکاتی ماڵی خوا بدات و، لە خوا نەبێ لە هیچ کەسێکیش نەترسێ ئا ئەو جۆرە کەسانە ئومێد هەیە خوای ڕێنماییکار ڕێی ڕاستیان پێشانبدات.**

٦٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ، قَالَ: «أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللّٰهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللّٰهِ أَسْوَاقُهَا»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین شوێن لە لای خوا مزگەوتەکانن، وە بوغزێنراوترین شوێن لە لای خوا بازاڕەکانن (چونکە بازاڕەکان درۆو فێڵ و سوێندی بە ناهەقی زۆر تێدا دەخورێ).**

٦٩- {عَنْ عُبَيْدِ اللّٰهِ الْخَوْلَانِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ، عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ، حِينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ ﷺ: إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ، وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللّٰهِ، بَنَى اللّٰهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ»}[٢].

---

(١) أَخرَجَهُ مسلم: ٦٧١، وابن حبان: ١٦٠٠.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٤٣٩، وَمُسْلِم: ٥٣٣.

واتە: عوبەیدوڵڵای خەولانی دەگێڕێتەوە کە گوێی لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووە، کاتێک دووبارە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ نۆژەن کراوەتەوە (لەسەردەمی ئەودا)، لە وەڵامی ئەو خەڵکەی کە پێیان باش نەبووە مزگەوتەکە دەستکاری بکرێ، عوسمان ﷺ گوتوویەتی: بەڕاستی ئێوە ژمارەتان زۆر زیاد بووە، وە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بۆ خوای پەروەردگار مزگەوتێکی دروست کرد، خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا خانووێکی وەک ئەوی بۆ لە بەهەشت دروست دەکات.

٧٠- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّه عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ بَنَى مَسْجِداً لا يُرِيدُ بِهِ رِيَاءً وَلا سُمعة، بَنَى اللّهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجنّة»}[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مزگەوتێک دروست بکات مەبەستی پێی ڕووپامایی و ناوبانگ بڵاوبوونەوە نەبێت، ئەوە خوا خانووێکی بۆ لە نێو بەهەشت دروست دەکات.

## دەربارەی: ئەنجامدانی نوێژ لە مزگەوتی: حەڕام، مەدینە، قوبا

٧١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»}[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لەو مزگەوتەی مندا (واتە: مزگەوتی مەدینە)، چاکترەو خێری زیاترە لە هەزار نوێژ کە لە مزگەوتەکانی دیکەدا غەیری ئەو ئەنجام بدرێ، جگە لە مزگەوتی حەڕام.

---

(١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي (الأوسط): ٧٠٠٥، انظر: (الصحيحة): ٣٣٩٩.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١١٣٣، وَمُسْلِم: ١٣٩٤.

**٧٢-** {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ»}[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لە مزگەوتی حەڕام (مزگەوتی مەککە) خێری زیاترە لە سەد هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی دیکە.**

**٧٣-** {عَنْ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَطَهَّر فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ أَتَى مَسْجِد قُبَاءَ، فَصَلَّى فِيه صَلاةً، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ»}[٢].

**واتە: سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی پاک بکاتەوە لە ماڵی خۆی (واتە: دەستنوێژ بشوات)، پاشان بێتە مزگەوتی قوباء نوێژی تێدا بکات، ئەوە ئەو کەسە پاداشتی عومرەیەکی بۆ هەیە.**

## دەربارەی: ڕۆژووگرتن

**پێناسەی ڕۆژوو: (الصَّوْمُ فِي الأَصْلِ: الإمْسَاكُ عَنِ الفعْلِ مَطْعَماً كَانَ، أو كَلاَمَاً، أو مَشِياً)، (صَوْم) لە ئەسڵی زماندا بە مانای نەفسی خۆگرتنەوەیە لە هەر کردەوەیەک، خواردن بێ، یان قسەکردن بێ، یان ڕۆیشتن بێ.**

**(والصَّوْمُ فِي الشَّرْعِ: إمْسَاكُ المُكَلَّفِ بالنِّيَّةِ مِنَ الخَيْطِ الأَبْيَضِ إلى الخَيْطِ الأَسْوَدِ عَنِ المَفطِراتِ)، وە (صوم) لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لەوەی کەسێک کە تەکلیفی شەرعیی کەوتبێتە سەر، بە نیەتەوە لە دەزووی سپی بەرەبەیان هەتاکو دەزووی ڕەشی ئێوارە، خۆی بگرێتەوە لە هەموو**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٥٢٧١، انظر: (صحيح الجامع): ٣٨٣٨.

(٢) أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ: ١٤١٢، انظر: (صحيح سُنن ابْنُ مَاجَهْ).

**ئەوانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن، وەک: (خواردن و خواردنەوەو جووتبوونی ژن و مێردو خۆڕشاندنەوە).**

**٧٤-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ بە بڕوا پێ بوونەوەو بە چاوەڕوانی پاداشتەوە، ئەوە خوا لە گوناهی ڕابردووی خۆش دەبێ.**

**٧٥-** {عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک وازنەهێنێ لە قسەی درۆ، وە کردەوەی خراپ و حەرام واز لێ نەهێنێ، خوا هیچ پێویستی بەوە نیە کە خواردن و خواردنەوەکەی واز لێ بهێنێ.**

**٧٦-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً واحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شەونوێژ بکات لە ڕەمەزاندا، بڕوای پێ هەبێ و چاوەڕێی پاداشت بێ، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووردرێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٧١٧٠، والبُخَارِي: ٣٨، وَمُسْلِم: ٧٦٠.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٨٠٤.

(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٣٧، وَمُسْلِم: ٧٥٩.

٧٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»}[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەرکامێک لە ئێوە توانی (واتە: لە ڕووی جەستەیی و دارایی و مەعنەوی) با هاوسەرگیری بکات، ئەوە بۆ چاوی باشترە[٢]، وە بۆ داوێن پاکیشی چاکترە، وە هەر کەسێک نەیتوانی (هاوسەرگیریی بکات) با ڕۆژوو بگرێ، ئەوە دەبێتە هۆی ئارەزوو کەمبوونەوەی.**

٧٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَو شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ»}[٣].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک لە بیری چوو بەڕۆژوو بوو، شتێکی خوارد، یان شتێکی خواردەوە، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، ئەوە خوا ئەو خواردن و خواردنەوەی داوەتێ. ئەگەر واتە: مادام لە بیری چووبێ ئەوە ڕۆزییەکە خوا پێی داوەو خەڵاتی کردوە ڕۆژووە کەشی زیانی نەهێناوە.**

٧٩- {عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمَاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلاَّ بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ اليَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيْفَاً»}[٤].

---

**(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٤٧٧٨، وَمُسْلِم: ١٤٠٠.**

**(٢) کە چاو ناگێڕێ لە ئافرەتان، چونکە هەر کەس حەڵاڵی خۆی هەبێ مادام ئیمانێکی باشی هەبێ، چاوی لە حەرام نابێت.**

**(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٦٦٩، وَمُسْلِم: ٢٧٠٩، وَاللَّفْظُ لَهُ.**

**(٤) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٨٤٠، وَمُسْلِم: ١٦٧.**

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک یەک ڕۆژ لە پێناوی خودا بەڕۆژووبێ، خوا حەفتا ساڵە ڕێ بە هۆی ئەو ڕۆژەوە دەم و چاوی لە ئاگری جەهەننەم دووردەخاتەوە.**

٨٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَت أَبوَابُ الجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخیش دادەخرێن، وە شەیتانەکانیش زنجیر دەکرێن.**

**تێبینی: هەر چەندە شەیتانەکان لە ڕەمەزاندا بەستراونەتەوە، بەڵام خراپەکاریش هەر هەیە، ئەوە لەبەر ئەوە نیە کە شەیتانەکان نەبەستراونەتەوە، بەڵکو لەبەر خراپەکاری نەفسی ئینسانەکانە کە پێشی ڕەمەزان پەروەردەیان لە شەیتانەکانەوە وەرگرتووەو تەئسیری شەیتانەکانیان هێشتا لەسەر ماوە.**

٨١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَصُومُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ وَقَبْلَهُ يَوْمٌ أَوْ بَعْدَهُ يَوْمٌ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی هەینی (بە تایبەتی) بە ڕۆژوو مەبن، مەگەر ڕۆژێک لە پێشیەوە، یان ڕۆژێک لە دوایەوەی لەگەڵ بێ.**

٨٢- {عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، قَالَ: «إِنْ شِئْتَ أَنْ تَصُومَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُفْطِرَ فَأَفْطِرْ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٧٩٩، وَمُسْلِم: ١٠٧٩.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٠٤٢٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٣) أَخْرَجَهُ النَّسَائِي: ٢٢٩٧، وَصَحَّحَهُ الألباني.

**واتە: حەمزەی کوڕی عەمرٍ ﷺ پرسیاری کردوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتن لە سەفەر؟ فەرموویەتی: ئەگەر دەتەوێ بە ڕۆژووبیت، ڕۆژووبگرە، ئەگەر دەتەوێ بە ڕۆژوو نەبیت، مەیگرە.**

٨٣- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ»}[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ڕەمەزاندا سەفەرمان کرد، نە ئەوەی بە ڕۆژوو بوو ڕەخنەی لەوە گرت کە بەڕۆژوو نیە، نە ئەوەش بە ڕۆژوو نەبوو ڕەخنەی لەوە گرت کە بە ڕۆژوو بوو.**

٨٤- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» فَقَالُوا: صَائِمٌ، فَقَالَ: «لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ»}[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێک بوو، قەرەباڵغییەکی بینی پیاوێکیش سێبەری لێکرابوو، فەرمووی: ئەوە چیە؟ گوتیان: بەڕۆژووە فەرمووی: ڕۆژووگرتن لە سەفەردا چاک نییە.**

---

(١) أَخرَجَهُ مالك في الموطأ: ١٠٢٣، وَمُسْلِم ٢٦٧٦.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ١٨٤، وَمُسْلِم: ١٨٤٤.

## بەرهەم و حیکمەتی ڕۆژووگرتن

یەک: لە ڕووی مەعنەوییەوە: سوودی زۆرمان پێدەگەیەنێ، دڵی ئینسان صاف و خاوێن دەکاتەوەو، ڕووحی ئاسوودە دەکات، ئینسان لە خوا نزیک دەکاتەوەو، لایەنی ڕووحی و ئیمانی تێدا زیاد دەبێت.

دوو: لە ڕووی ئەخلاقییەوە: بە ڕاستی ڕۆژوو کاریگەری زۆری هەیە بۆ جوان کردنی ئەخلاقی ئینسان، هەرچەندە بەداخەوە هەندێک لە مسوڵمانان بە پێچەوانەوە لەمە حاڵی بوون، وە پێیان وایە کە ئەگەر بەڕۆژوو بوون، بەڕۆژوو بوونەکەیان بیانوو و پاساوە بۆ ئەوەی قیچکە تەنگ بن و، بێ حەوسەڵەبن و، زوو تووڕەبن، لە حاڵێکدا کە ڕۆژووگرتن بۆ ئەوەیە کە ئینسان ئەخلاقی جوان بێ و خۆی کۆنترۆڵ بکات و زمانی خۆی بگرێتەوە لە خراپەو صەبری زیاتری پەیدابێ.

سێ: لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە: ئینسانی ڕۆژووەوان هەست دەکات، ئەگەر دەوڵەمەندیش بێت و هەرگیزیش برسی نەبووبێ، بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا لەو کاتەدا کە بەڕۆژوو دەبێ، هەست دەکات کە برسیەکان هەست بە چ ئێش و ژانێکی برسیەتی دەکەن.

چوار: لە ڕووی ئابووریەوە: ڕۆژووگرتن جۆرێکە لە لێگرتنەوە، هەرچەندە ئەوەشیان وەک گوتم زۆر لە مسوڵمانان بەهەڵە مامەڵە لەگەڵ ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزاندا دەکەن، کە ئەوەی لە کاتەکانی دیکەدا بە دوو مانگان دەیخۆن، هەمووی لە مانگی ڕەمەزاندا دەیخۆن! وە ئەو ژەمە نیوەڕۆیەی کە دەیپەڕێنن، بەربانگ و پارشێوان بە زیادەوە قەرەبووی دەکەنەوە، کە ئەوکاتە حیکمەتی ڕۆژووگرتنەکەش دەفەوتێ، چونکە ڕۆژووگرتن حیکمەتەکەی ئەوەیە خۆت کۆنترۆڵ بکەی لێی بگریەوە.

پێنج: لە ڕووی تەندروستییەوە: هـــەموو پزیشکەکان لەسەر ئەوە یەک دەنگن کە ڕۆژووگرتن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ماددە زیادە زیانبەخشانەی لە جەستەدا کۆبوونەوە، وەک چەوریی دەتوێنێتەوە، بە هۆی ڕۆژووەوە ئینسان صاف دەبێتەوەو، لە بێژینگ دەدرێ بە تایبەتی ئەگەر ڕۆژووەکانی بەردەوام بوون.

## دەربارەی: زەکات

پێناسەی زەکات: (أَصْلُ الزَّكاةِ: النُّمُوُّ الحَاصِلُ عَنْ بَرَكَةِ اللّهِ تَعَالى، الزَّكَاةُ: البَرَكَةُ والنَّمَاء وَالطَّهَارَة وَالصَّلاَح وَصَفوَةُ الشَّيءِ والمقدَار الَّذِي حَدَّدهُ الشَّـرْع أَن يُعْطى الفُقَراء مِنْ أَمْوَال الأَغْنِيَاء).

واتە: ئەسڵی وشەی (زَكَاة) یانی: گەشەکردن بە هۆی بەرەکەتی خوای بەرزەوە، وە وشەی (زکاة) بە چەند مانایەک دێ: بە مانای گەشەکردن و پاکبوونەوەو چاک بوون، وە بە مانای پوختەی شتیش دێت، وە بە مانای ئەو ئەندازەیەش دێت کە شەرع دیاری کردوە لە ماڵی دەوڵەمەندان بدرێ بە هەژاران و نەداران. بۆیە لە کاتی زەکاتدان ئیماندار ئەگەر حاڵی بێ لە مانا زمانەوانیەکەی، زەکات دەبێ، هەم ماڵ و هەم دڵ و دەروون پاک بکاتەوە.

٨٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ فِيهِ، وَمَنْ جَمَعَ مَالاً حَرَاماً ثُمَّ تَصَدَّقَ بِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ فِيهِ أَجْر، وَكَانَ إِصْرُهُ عَلَيْه»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەکاتی ماڵت دەرکرد، ئەوە ئەو واجبەت جێبەجێ کردوە کە لەسەرت

---

(١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّان: ٣٢١٦، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

بووە تێیدا، وە هەر کەسێک ماڵی حەرام کۆبکاتەوە، پاشان بیکاتە خێرو صەدەقە، ئەوە لەم خێرەدا هیچ پاداشتی بۆ نیە، بەڵکو تاوانەکەی لەسەرە (کە بە حەرام کۆکردنەوەکەیە، نەک خێرکردنەکە).

٨٦- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: يَا رَسُولَ اللّه ﷺ، أَرَأَيْتَ إِذَا أَدَّى رَجُل زَكَاةَ مَالِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ أَدَّى زَكَاةَ مَالِهِ، فَقَدْ ذَهَبَ عَنْهُ شَرُّه»}[١].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە نێو کۆمەڵێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! حاڵی ئەو کەسە چۆن دەبینی کاتێک زەکاتی ماڵەکەی دەدات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس زەکاتی ماڵی بدات، ئەوە بە دڵنیایی شەڕو خراپەی ئەو ماڵەی لێ دوورکەوتۆتەوە.

٨٧- {عَنِ أَبِي قَزَعَةَ حُجَيْر بْنِ بَيَانٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَا مِنْ ذِي رَحِمٍ يَأْتِي ذَا رَحِمَهُ، فَيَسْأَلُهُ مِنْ فَضْلِ مَا عِنْدَهُ، فَيَبْخَلُ بِهِ عَلَيْهِ، إلاَّ أُخْرِجَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ شُجَاعٌ مِنَ النَّار، يَتَلَمَظُ حَتَّى يُطَوِّقَهُ»}[٢].

واتە: ئەبو قەزەعەی حوجەیری کوڕی بەیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کە دەچێتە لای خزمەکەی داوای هاوکاری لێدەکات لە زیادەی ئەو ماڵەی لە لایەتی ئەویش ڕەزیلی بکات و پێی نەبەخشێ، حەتمەن لە ڕۆژی دوایدا ئەو ماڵ و سامانە بۆی دەبێتە مارێکی گەورەو زمانی دەردێنێ، هەتاکو لە گەردنی دەئاڵێ[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ الطبراني في (الأوسط): ١٥٧٩، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ٧٤٣.

(٢) أَخْرَجَهُ الطبراني في الكبير: ٢٣٤٣، وفي الأوسط: ٥٥٩٣، قَالَ الْهَيْثَمِي (١٥٤/٨): إِسنَادُهُ جيد.

(٣) دیارە ئەم فەرمایشتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسان ئەگەر ڕەزیلی و چرووکی بکات بەرانبەر خزمی هەژارو نەداری، گوناهەکەی زیاترە، وەك ئەوەی بەرانبەر خەڵکی دیکەدا بیکات، بۆچی؟ چونکە خزم هەقی زیاترە، وە چاوەڕوانیشی زیاترە.

٨٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ، «يَعْنِي بِشِدْقَيْهِ»، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾آل عمران»}[1].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خوا ماڵ و سامانێکی پێبدات، زەکاتەکەی لێنەدات، لە ڕۆژی دوایی دا ئەو ماڵ و سامانەی کە زەکاتی لێنەداوە بۆی دەبێتە مارێکی گەورەی کەچەڵ[2]، دوو خاڵی ڕەشی لە پشت چاویەتی (ئەو مارانەی کە خاڵی ڕەش لە پشت چاویانە ژەهریان زۆر پیسە)، ئەو مارە لە گەردنی دەئاڵێ لە ڕۆژی دوایی دا، پاشان شەویلگەکانی دەگرێ (یانی کە لە ملی ئاڵا، ئنجا گەز لە هەردوو شەویلگەکانی دەدات) دوایی پێی دەڵێ: من ماڵەکەتم، من گەنجینەکەتم (واتە: ئەو ماڵەم کە خەزنت دەکردم و کۆتدەکردمەوەو حەقت لێ نەدەدا) دواییش ئەو ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾آل عمران.

٨٩- {«عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُوْلَ اللّٰهِ ﷺ! أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: أَنْ تَصَّدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ، شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ، وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ»}[3].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین ماڵ بەخشین کە گەورەترین پاداشتی هەیە کامەیە؟ فەرمووی: خێرو چاکە بکەی لە کاتێکدا کە لەش ساغیت و ماڵ و**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ١٣٣٨، والنَّسَائِي في الكبرى: ٢٢٦١، وأَخرَجَهُ أَيْضاً: أَحْمَد: ٨٦٤٦.

(٢) شُجَاع: الحيَّة الذَّكَر.

(٣) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٩٧٦٧، والبُخَارِي: ٢٥٩٧، وَمُسْلِم: ١٠٣٢.

سامانەکەشت خۆشدەوێ (لەبەر ئەوەی تام لە شتەکان دەکەیت کە پێی دەکڕی)، وە بە هیوای دەوڵەمەند بوونی و ترسیشت هەیە لە هەژاری (ئا ئەوە چاکترین بەخشینە)، نەک لێ بگەڕێی هەتا ڕووح دەگاتە گەروو، ئەو کاتە بڵێی: ئەوەندە بۆ فڵان و ئەوەندەش بۆ فڵان، چونکە ماڵەکە تازە (بە هۆی میرات) هەر بۆتە هی فڵان و فیسار.

تێبینی: هەر چاکەو ماڵ بەخشینێک، کە ئەم هۆکارانەی تێدا کۆدەبنەوە، پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە:

یەکەم: لەشت ساغ بێ، نەک بکەویە کاتی گیان کێشان و نیشانەکانی مردنت لێ دەربکەون، ئنجا بێی ماڵەکەت ببەخشی!

دووەم: نەک زۆر زۆر دەوڵەمەندبی و هیچ پێویستیت بەو ماڵ و سامانە نەبێ، بەڵکو بە خۆت پێویستیت پێی هەبێ، ئەوجار بێی ببەخشی.

سێیەم: یاخود حەز بکەی دەوڵەمەندبی و هەبوونی ماڵ و سامانت زۆر پێ خۆشبێ و، لە هەمان کاتدا زۆریش لە هەژاریی بترسێی، لەبەر ئەوەی هەل و مەرجەکە سەخت و دژوارە، لەو حاڵەتانەدا ئەوە باشترین خێرو چاکەو ماڵ بەخشینە.

٩٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يقُولُ الْعَبْدُ: مَالِي مَالِي، إِنَّمَا لَهُ مِنْ مَالِهِ ثَلاثٌ: مَا أَكَلَ فَأَفْنَى، أَوْ لَبِس فَأَبْلَى، أَوْ أَعْطَى فَاقْتَنَى، وما سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ ذَاهِبٌ وَتَارِكُهُ لِلنَّاسِ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە (مرۆڤ) هەر دەڵێ: ماڵەکەم، ماڵەکەم، لە ماڵەکەشیدا تەنها سێ شتی بۆ هەن: ئەوەی خواردوویەتی و نەماوە، یان ئەوەی پۆشیویەتی و دڕاوەو کۆن بووە، یان ئەوەی بەخشیویەتی و هەڵیگرتوە بۆ دوارۆژ، وە

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٧٩٩، وَمُسْلِم: ٢٩٥٩، وابن حبان: ٣٢٤٤.

جگە لەوانە هەمووی ڕۆیشتوەو بۆ خەڵک جێی هێشتوە (کەواتە: دەبێ مرۆڤ تەنها ئومێدی بە بەخشینەکەی هەبێ).

## بەرهەم و حیکمەتی زەکات دەرکردن لە ماڵ

بێگومان هیچ شتێک نیە خوای زاناو کاربەجێ لەسەر مسوڵمانانی فەڕز کردبێ و حیکمەتی تێدانەبێ، جا جاری وایە هەر لە دونیا حیکمەتەکەی دەزانرێ و، جاری واش هەیە تا لە دونیا ماوین حیکمەتی ئەو شتە نازانین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە بڕوای تەواومان بە دادگەریی و حیکمەتی خوا هەیە وەک مسوڵمان زۆر لەو شتانە ناکۆڵینەوەو عەوداڵی زانینیان نین، ئەمەش بە ڕەچاو کردنی ئایەتی:

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنبياء، واته: (خوای پەروەردگار) پرسیاری لێناکرێتەوە لە هەرچی دەیکات و فەرمانمان پێ دەکات، بەڵکو ئەوە مرۆڤەکانن پرسیاریان لێ دەکرێتەوە لە هەرچی دەیڵێن و دەیکەن.

دەربارەی بابەتی زەکات، زانایان چەندین حیکمەتیان لە فەڕز کردنی دەرهێناوە، بە کورتی و پوختی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

یەک: پاککەرەوەی دڵ و دەروونی مرۆڤەکان لە ڕەزیلی و چرووکیی و خۆشەویستەیەکی لە ڕادەبەدەر بۆ ماڵ و سامان.

دوو: دروستکردنی تۆوی برایەتی لە نێو خەڵک و هەست کردن بە مافی ئەوانەی دیکە.

سێ: جێبەجێ بوونی بیمەی کۆمەڵایەتی.

چوار: سڕانەوەی گوناهو تاوانەکانی کەسی گوناهبار.

پێنج: پارێزرانی کەسی خاوەن ماڵ لە بەڵاو ناخۆشیی و ناڕەحەتییەکان.

شەش: زیاد بوونی ماڵ و سامانی زەکاتدەر.

حەوت: نزیک بوونەوە لە خوا، وە بڕوا بوونی تەواو بە پاداشتەکانی.

هەشت: هەژارەکان چاویان نابڕنە ماڵی دەوڵەمەندەکان، زیانیان پێناگەیەنن.

نـۆ: دروستکردنی خۆشەویستی و برایەتی لە نێو تاکەکانی کۆمەڵگە.

## دەربارەی: حەجی ماڵی خوا

(الحــــج): یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، وە هەر مسوڵمانێک پێویستە لەسەری لە هەموو تەمەنی جارێک ئەنجامی بدات، نکووڵیی کردنی ئەم پایە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەباتە دەر، وە ئەنجامدانی حەج پێویست و واجبە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی (مکلف) بە مەرجێک کە بتوانێ ئەم فەرزە گەورە ئەنجام بدات، وە هەروەها پێویستیشە مسوڵمانی موکەللەف هەتا دەتوانێ زوو ئەنجامی بدات و دوای نەخات، دیارە بەڵگەی زۆریش هەن لەسەر فەرز بوونی ئەم پایەی ئیسلام، هەم لە قورئان و هەم لە فەرموودە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ٢٧ ﴾ الحج.

وە فەرموودەش زۆرن لەوبارەوە، بەڵام لەم پێشەکییە تەنها ئەم فەرموودە بە بەس دەزانین کە پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: «بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ»[1]، واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتمان بەوە کە بێجگە لە خوا پەرستراوی دیکەنین، وە کە موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٨، وَمُسْلِم: ١٦.

خوایەو، بەرپاکردنی نوێژو، زەکات دان و، گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، وە حەجی ماڵی خوا.

حەجێک کە قبووڵ کراوبێ لە خاوەنەکەی هۆکاری پاک بوونەوەیەتی لە هەموو گوناهەکانی و پاداشتەکەی بەهەشتە، وە لە گوناهەکانی دەشۆردرێ و پاک دەبێتەوە وەک ئەو ڕۆژەی کە لە دایک بووەو چاوی بە دونیا هەڵێناوە، وەک لەم فەرمووە هاتوە:

٩١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ سمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ: «مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ رَجع كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس حەج بۆ خوا ئەنجام بدات و هیچ وشەی ناشرین و خراپ نەڵێ، وە هیچ شتێکی لە سنوور دەرچوو نەکات، کە دەگەڕێتەوە، وەک ئەو ڕۆژەیە کە لە دایک بووە (واتە: لە گوناهان پاک دەبێتەوە).

## چەند فەرموودەیەك لەبارەی حەج

٩٢- {عَنْ مَاعِزٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَحْدَهُ، ثُمَّ الْجِهَادُ، ثُمَّ حَجَّةٌ بَرَّةٌ تَفْضُلُ سَائِرَ الْعَمَلِ، كَمَا بَيْنَ مَطْلِعِ الشَّمْسِ إِلَى مَغْرِبِهَا»}[٢].

واتە: ماعز ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا کام کردەوە باشترینی کردەوەکانە؟ فەرمووی: بڕواهێنان بەوە کە خوا تاک و تەنیایە، پاشان تێکۆشان لە پێناوی خوا، پاشان حەجێکی قبووڵ کراوە، (پاداشتەکەی

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٧٣٧٥، والبُخَارِي: ١٤٤٩، والنَّسَائِي: ٢٦٢٧.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٩٠٣٢، تعليق شعيب الأرنؤوط «حديث صحيح، وانظر: (صحيح الجامع): ١٠٩٢.

**جیاوازو زیاترە) لە گشت کردەوەکانی تر بە قەدەرایی نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.**

**٩٣-** {عَن جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَدِيمُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ»}[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەج و عومرە بە دوای یەکتردا بکەن، چونکە ئەم دووانە هەژاریی و گوناح لادەبەن، وەک چۆن کورەی ئاگر پیسی و ژەنگی ئاسن لادەبات و نایهێڵێ.**

**٩٤-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةَ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرە بۆ عومرە کەفارەتی گوناهی نێوانیانن، وە حەجی قبووڵکراو هیچ پاداشتێکی نیە جگە لە بەهەشت (کە هەموو نازو نیعمەتەکانیش لە بەهەشتن، هەرچی خۆشی و شادی هەیە لەوێیە).**

**٩٥-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَرْفَعُ إِبْلُ الْحَاجِّ رِجْلاً وَلاَ تَضَعُ يَداً، إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ تَعَالَى لَهُ بِهَا حَسَنَةً، أَوْ مَحَا عَنْهُ سَيِّئَةً، أَوْ رَفَعَهُ بِهَا دَرَجَةً»}[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو حوشترەی حاجی گەشتی حەجی پێ ئەنجام دەدات، هیچ پێیەکی بەرز ناکاتەوە، وە هیچ دەستێکی دانانێ حەتمەن بە هەر**

---

(١) أَخرَجَهُ الطبرني في (الأوسط): ٤٩٧٧، انظر: (الصحيحة): ١١٨٥.

(٢) أَخرَجَهُ مالك: ٧٦٧، وأَحْمَد: ٩٩٤٩، والبُخَارِي: ١٦٨٣، وَمُسْلِم: ١٣٤٩.

(٣) أَخرَجَهُ البَيْهَقِي في (شعب الإيمان): ٤١١٦، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ١١٠٦.

**کامێکیان خوای بەرز چاکەیەک بۆ خاوەنەکەی دەنووسێ، یان گوناهێکی لـێ دەسڕێتەوە، یان پلەیەک بەرزی دەکاتەوە.**

٩٦- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ فَلْيَتَعَجَّلْ، فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ، وَتَضِلُّ الضَّالَّةُ، وَتَعْرِضُ الْحَاجَةُ»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دەیەوێ فەریزەی حەج جێبەجێ بکات، با پەلە بکات، چونکە لەوانەیە نەخۆش بکەوێ، یان بزر ببێ، یان پێویستیەکی بێتە پێش (کە نەتوانێ ئەم کارە جێبەجێ بکات).**

٩٧- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ أَبِيهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهَا)، قَالَتْ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُرِيدُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ؟ فَقَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى جِهَادٍ لاَ شَوْكَةَ فِيهِ؟» قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «حَجُّ الْبَيْتِ»}[2].

**واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو سولەیمان لە نەنکی (واتە: لە دایکی باوکیەوە) دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: دەمەوێ لە پێناوی خوا جیهاد بکەم و تێبکۆشم، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا ڕێنماییت نەکەم بۆ جیهادێک کە هیچ دڕکێکیشی تێدا نەبێت؟! گوتم: با، فەرمووی: حەج کردنی ماڵی خوا (واتە: بە نیازێکی پاک و پارەیەکی حەڵاڵ گەشتێک بکە بۆ ماڵی خوای تعالی، بێ ئەوەی تووشی گوناهو تاوان بێت لەوێ، ئەوە وەک ئەمە وایە کەوا لە پێناوی خوای تعالی جیهادت کردبێ).**

٩٨- {عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللّٰهِ ﷺ أَلاَ نَغْزُو وَنُجَاهِدُ مَعَكُمْ؟ فَقَالَ: «لَكُنَّ أَحْسَنُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلُهُ، الْحَجُّ

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد، ١٨٣٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن.

(٢) أَخْرَجَهُ الطَّبراني في (الكبير): ٧٩٢، انظر: (صحيح الجامع) ٢٦١١.

حَجٌّ مَبْرُورٌ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَلاَ أَدَعُ الْحَجَّ بَعدَ إِذْ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُوْلِ اللّهِ ﷺ}[١].

**واتە: خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەگەڵ ئێوە غەزاو جیهاد نەکەین؟ فەرمووی: بەڵام باشترین و جوانترین جیهاد، ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوایە، حەجێکی قبووڵ کراو، عائیشە خوا لێی ڕازی بێ فەرمووی: وازم لە حەج کردن نەهێنا دوای ئەوەی ئەوەم بیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ.**

٩٩- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْها) أَنَّ رسُولَ اللّه ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى أَحدُكُمْ حَجَّهُ، فَلْيُعَجِّلِ الرِّحْلَةَ إِلَى أَهْلِهِ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لأَجْرِهِ»}[٢].

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە حەجی ئەنجامدا با پەلە بکات لە گەڕانەوەی بۆ لای خاوو خێزانەکەی، چونکە بە دڵنیایی ئەمە پاداشتی زیاترە.**

## دوعاو پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ

**خوای پەروەردگار زۆر جەختی لەسەر دوعاکردنی بەندەکانی کردۆتەوە، وە زۆری پێخۆشە بەندەکانی لێی بپاڕێنەوەو داوای لێبکەن، بۆیەش فەرموویەتی:** ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾البقرة، **واتە: وە هەر کاتێک بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی (واتە: لە تۆ ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوە (با بزانن کە) من نزیکم، وەڵامی داواکەر**

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٧٦٢.

(٢) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ١٧٥٣، وقال: صحيح على شرط الشيخين، الدارقطني: ٢٨٩، (الجامع الصغير): ٧٣٢.

دەدەمەوە هەرکات لێم بپاڕێتەوە، دەجا با ئەوانیش بە دەنگمەوە بێن و بڕوام پێ بێنن، بەڵکو سەر ڕاست بن.

خوای بەرزو مەزن زۆر بە مسۆگەریی دەفەرموێ: من وەڵامی داوای داواکار دەدەمەوە ئەگەر لێم پاڕایەوە، لێرەدا یەکێک بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی زۆر کەس دەپاڕێتەوە لە خواو ئەو شتەش کە بۆی دەپاڕێتەوە جێبەجێ نابێ؟

دەڵێین: فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، زۆر جوان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە وەڵامدانەوەی خوا بۆ پاڕانەوەی بەندەکانی هەر یەک شێوە نیە، وەک لەم دەقەی خوارەوە هاتوە:

١٠٠- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ، لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ، وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا، قَالُوا إِذًا نُكْثِرُ! قَالَ: اللَّهُ أَكْثَرُ»}[1].

واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێک نیە لە خوا بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەک، پاڕانەوەکە لە خودی خۆیدا گوناح نەبێت، وە مایەی پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەبێ، ئەوە خوا یەکێک لەو سێ شتانە بۆ ئەو بەندەیەی خۆی دەکات: یان ئەوەتا ئەو شتەی داوای دەکات یەکسەر بۆی جێبەجێدەکات، یاخود بۆی هەڵدەگرێ و پاداشتەکەی لە دوارۆژدا دەداتەوە، یان بە قەدەر ئەو شتە باشەی کە داوای کردوە، خراپەیەکی وەک وی لێ لادەدات، گوتیان: مادام ئێمە زیادی دەکەین، فەرمووی: خواش زیاتری دەکات.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١١١٤٩، انظر: (صَحيح الترغيب والترهيب): ١٦٣٣.

بۆ نموونە: (داوای شتێکی باشی کردوە، خوا شتە باشەکەی بۆ ناکات حیکمەتی خوا وا ناخوازێ کە ئەم کارەی بۆ بکات، بەڵام بە قەدەر ئەو شتە باشە یاخود زیاتریش خوا خراپەو بەڵای لێ لادەدات).

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان کاتێک کە لە خوا دەپاڕێتەوەو خوا یەکسەر وەڵامی ناداتەوە، واتە: وەڵامەکە نابینێ با نائومێد نەبێ، وە دوعا گەورەترین جۆری عیبادەتەو زۆرترین پاداشتی لە نێو خۆدا هەڵگرتوە، چونکە سوننەتی هەموو پێغەمبەران بووە، سەلامی خوایان لەسەر بێ، وە وەک خوای زاناو شارەزا دەربارەی پێغەمبەر زەکەریاو خێزانەکەی کە هەمیشە دوعای منداڵێکی صاڵحیان دەکرد، دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ٩٠ ﴾ الأنبياء.

ئنجا ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەبینین خوای پەروەردگار بە ئارەزوودانەبەرو هاندان وەسفێکی زۆر جوانی ئەو کەسانە دەکات کە دوعا دەکەن، وەک فەرموویەتی: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧ ﴾ السجدة.

واتە: تەنیشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لە خەو هەڵدەستن و شەو نوێژ دەکەن)، هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بە ترس و هیواوە، وە لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون دەبەخشن . ئنجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە.

لە کۆتایی ئەم بەشە دەڵێم:

**١)- دوعاکردن سیفەتی ئەهلی بەهەشتیەکانە، وەک خوای پەنهانزان لەسەر زاری بەهەشتیەکان دەفەرموێ:**

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾یونس.

**٢)- پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: ئێمە تەنها دوعامان لەسەرەو دەیکەین، ئەنجامەکەش پەیوەندی بە خواوە هەیە، واتە: تۆ بەندایەتی و خوا بەیەکگری خۆت بۆ خوای تعالی بسەلمێنە بە دوعا کردن، ئەوەی دیکە واز لێبێنە بۆ خوای زاناو کاربەجێ، خۆی دەزانێ چیت بۆ دەکات.**

**١٠١-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ»}[1].

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتێکدا زیکرو یادی خوای دەکرد.**

---

**(١) علقه البُخَارِي (٢١٤/فتح)، ووصله مسلم: ٣٧٣.**

## زۆرترین دوعای پێغەمبەر ﷺ ئەمە بووە

١٠٢- «عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاء النَّبِيِّ ﷺ: اللَّهُمَّ رَبَّنَا! آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»}[١].

**واتە: ئەنەس ﵁، دەڵێ: زۆرترین دوعای پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا! آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)، واتە: ئەی خوایە، پەروەردگارمان! لە دونیادا چاکەو لە دوارۆژیشدا چاکەمان بدەیەو لە سزاو ئازاری ئاگر بمانپارێزە.**

## گەورەترین و چاکترین دوعاو پاڕانەوە

١٠٣- {«اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»}[٢].

**واتە: گەورەترین و چاکترین پاڕانەوەی داوای لێخۆش بوون ئەوەیە، کە (بەندە) بڵێ: ئەی خودایە، تۆ پەروەردگارمی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی دیکە نیە (بە هەق)، وە تۆ منت دروست کردووەو من بەندەی تۆم، وە من تا بتوانم لەسەر بەڵێن و پەیمانەکەمم کە بە تۆم داوە، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی کردەوەی خۆم، وە دان دەنێم بە نیعمەتەکانت**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٦٠٢٦، وَمُسْلِم: ٢٦٩٠

(٢) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ١٧١٧١، والبُخَارِي: ٥٩٤٧.

**لەسەرم و دان دەنێم بە گوناهەکانم دا، لێم خۆشبە، بێگومان جگە لە تۆ کەس (بۆی نیە لە گوناهی بەندەکان) خۆشبێ، وە هەر کەس لە ڕۆژدا ئەوە بڵێ، بەدڵیش باوەڕی تەواوی پێی هەبێت وە پێش هاتنی شەو لەو ڕۆژەدا بمرێ ئەو کەسە بەهەشتیە. وە هەر کەس لەو شەودا ئەوە بڵێ، وە بەدڵیش باوەڕی تەواوی پێی هەبێت، وە پێش هاتنی ڕۆژ لەو شەوەدا بمرێ ئەوە بەهەشتییە.**

**١٠٤-** {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّلاَةَ كَبَّرَ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ اهْدِنِي لأَحْسَنِ الأَعْمَالِ، وَأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ، لاَ يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَقِنِي سَيِّئَ الأَعْمَالِ، وَسَيِّئَ الأَخْلاَقِ لاَ يَقِي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ»}[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەستی بە نوێژ دەکرد الله أکبری دەکرد، پاشان دەیفەرموو: بەڕاستی نوێژو سەربڕین و ژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانییانە، هیچ هاوبەشێکی نیە، وە بەوە فەرمانم پێکراوەو یەکێکم لە مسوڵمانان، خوایە ڕێنماییم بکەی بۆ چاکترینی کردەوەکان و چاکترینی ڕەوشتەکان، کەس ڕێنمایی ناکات بۆ چاکترین ڕەوشت جگە لە تۆ، وە کردەوە خراپەکان و ڕەوشتە خراپەکانم لێ دووربخەرەوە، کەس کردەوەی خراپم لێ دوور ناخاتەوە جگە لە تۆ.**

**١٠٥-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا)، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ قَالَ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ»}[٢].

---

(١) أَخْرَجَهُ النَّسَائِي: ٨٩٦، انظر: (المشكاة): ٨٢٠.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٣٤٣٣، وقال: حسن صحيح غريب.

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەستی بە نوێژ دەکرد دەیفەرموو: خوایە پاک و بێگەردی و ستایش هەر بۆ تۆیە، وە ناوت پیرۆزو بە پێزەو، بەرزو بڵندی خاوەن هەموو شتێکی، وە هیچ پەرستراوێک (بە هەق) نیە جگە لە تۆ.**

## چەند دوعاو پاڕانەوەیەکی تایبەتی نێو نوێژدا

**١٠٦-** {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ إِذَا رَكَعَ: قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي»}[1].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە رکووعی دەبرد دەیفەرموو: خوایە ڕکووعم بۆ تۆ بردو بڕوام بە تۆ هێناو ملکەچی تۆ بووم، بیستن و بینین و ئێسک و مۆخ و دەمارم (هەمووی) ملکەچی تۆ بوو.**

**١٠٧-** {عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي قَالَ: «قُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مِنْ عِنْدَكَ مَغْفِرَةً، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری صیددیق ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دوعایەکم فێربکە کە لە نێو هەموو نوێژێکدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: بڵێ: خوایە من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوەو، هیچ کەسیش نیە لە**

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٧٧١.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٩٥٣.

گوناهان ببورێ جگە لە تۆ، دەسا بە لێخۆشبوونێکی تایبەت لەلایەن خۆتەوە لێم خۆشبە، چونکە بە دڵنیایی تۆ لێبوردەو میهرەبانیت.

١٠٨- {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ إِذَا سَجَدَ: قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُورَتَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ»}[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە سوجدەی دەبرد، دەیفەرموو: خوایە تەنها سوجدەم بۆ تۆ بردو ملکەچی تۆ بووم و بڕوام بە تۆ هێنا، ڕووخسارم سوجدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردوەو وێنەی کێشاوە بە چاکترین شێوەو، بیستن و بینینی بۆ کردینەوە، پاکی و بێگەردی بۆ چاکترینی دروستکارەکان.

## دوعای دوای نوێژە فەرزەکان

١٠٩- {عَنِ المغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»}[٢].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە نوێژ تەواو دەبوو، دەیفەرموو: هیچ پەرستراو نیە جگە لە خوا، تاکەو هاوبەشی نیە، موڵک هەر هی ئەوە، ستایش هەر بۆ ئەوەو، ئەو لەسەر هەموو شتێک بە توانایە، ئەی خوایە! هەر شتێک تۆ بیبەخشی کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ، ڕێگری نیە لەوەی کە تۆ بیبەخشی، وە هەر شتێک

(١) أَخرَجَهُ مسلم: ٧٧١.
(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٦٣٣٠، وَمُسْلِم: ١٣٧.

**کە تۆ نەیبەخشی بەخشەری بۆ نیە، (واتە: هەر شتێک کە تۆ بتەوێ نەبێ کەس ناتوانێ بیبەخشێ)، وە خاوەن سامان و دەسەڵات، ماڵ و سامان و دەسەڵاتەکەی لە بەرانبەر تۆدا سوودی پێناگەیەنێ.**

**١١٠-** {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ: «يَا مُعَاذُ وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ»، فَقَالَ: «أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ لاَ تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ تَقُولُ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ»}[١].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم و فەرمووی: ئەی موعاز! سوێند بە خوا خۆشم دەوێی، سوێند بە خوا خۆشم دەوێی، پاشان فەرمووی: ئەی موعاز وەصیەتت بۆ دەکەم وازنەهێنی لەم پاڕانەوەیە، لە دوای هەموو نوێژێک، بڵێ: خوایە یارمەتیم بدە لەسەر یادکردن و سوپاسگوزاریی کردن و باش پەرستنت.**

## پەناگرتن بە خوا لە چوار شت

**١١١-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە پەنات پێدەگرم لە چوار شت: لە زانستێک کە سوودی نەبێ، لە دڵێک کە لێت نەترسێ، وە لە نەفس و دەروونێک کە پڕ نەبێت و (بێ قەناعەت بێ)، وە لە دوعاو پاڕانەوەیەک کە وەڵام نەدرێتەوەو قبووڵ نەکرێت.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢١٧٢، وأبو داود: ١٥٢٢، والحَاكِمُ: ١٠١٠، وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٤٦٩، وأبو داود: ١٥٤٨، والنَّسَائِي: ٥٤٦٧، وابن ماجه: ٣٨٣٧، انظر: (صحيح أبي داود): ١٣٨٤.

**١١٢-** {عَنْ أَبِي مُوسى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَغْفِرُكَ لِمَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، إِنَّكَ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»}[1].

**وایە: ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوایە من داوای لێبوردنت لێدەکەم لەو گوناهانەی پێشم خستووە، وە ئەوانەی دواتر کردوومە، ئەوەی بە نهێنی کردوومە، ئەوەی بە ئاشکرا کردوومە، تۆ سەرەتاو کۆتایی، وە تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.**

**١١٣-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمَاً»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە سوودم پێ بگەیەنە لەو زانستەی کە فێرتکردووم، وە ئەوەم فێر بکە کە سوودی بۆم هەیە، وە زانستم بۆ زیاد بکە.**

## دوعای کەفارەتی کۆڕو مەجلیس

**١١٤-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ، فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ الاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، إلاَّ غُفِرَ لَهُ، مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ»}[3].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٩٥٠٧، قَالَ شُعَيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٣٥٩٩، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٣٨٣٣، والبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٤٣٧٦، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٣٤٣٣، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ١٥٠.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دانیشت لە کۆڕێک و مەجلیسێک زۆر قسەی بێ مانای کرد (یان زۆر قسەی بێ مانای تێدا کرا) پێش ئەوەی لەو کۆڕە هەڵسێ بڵێ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ الاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)، حەتمەن دەبوردرێ لە هەرچی لەو کۆڕە بووەو گوتراوە.**

**١١٥-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَن النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فيه، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ، إلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فإنْ شَاءَ عذَّبَهُمْ، وإنْ شَاءَ غَفَر لَهُمْ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کۆمەڵە خەڵکێک لە کۆڕێک دانیشن، زیکری خوای بەرزی تێدا نەکەن و صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرەکەیان نەدەن، حەتمەن بۆیان دەبێتە مایەی زەرەرمەندی و پەشێمانی، ئەگەر (خوا) بیەوێ سزایان دەدات، ئەگەر بشیەوێ لێیان خۆشدەبێ.**

## لە پەنهان دوعا کردن بۆ مسوڵمان

**١١٦-** {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ دَعَا لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ»}[٢].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک دوعا لە پاشملە بۆ براکەی بکات بە پەنهانی، فریشتەیەکی ڕاسپێردراو بەوەوە دەڵێ: (خوایە) قبووڵی بکە، هەروەها بۆ تۆش بە هەمان شێوە، (یانی: هەمان دوعا بۆ تۆ دەکات).**

---

(١) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٣٣٨٠، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي.

(٢) أَخْرَجَهُ مسلم: ٢٧٣٢، وأبو داود: ١٥٣٤.

## دووبارە کردنەوەی گوناهو تەوبە کردن

**١١٧-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَحَدُنَا يُذْنِبُ؟ قَالَ: يُكْتَبُ عَلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ مِنْهُ وَيَتُوبُ؟ قَالَ: يُغْفَرُ لَهُ وَيُتَابُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَيَعُودُ فَيُذْنِبُ؟ قَالَ: يُكْتَبُ عَلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ مِنْهُ وَيَتُوبُ؟ قَالَ: يُغْفَرُ لَهُ وَيُتَابُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»}[١].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ، دەڵێ: پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: یەکێک لە ئێمە گوناهێک دەکات، فەرمووی: لەسەری دەنووسرێ، گوتی: پاشان داوای لێبوردن دەکات و دەگەڕێتەوە، فەرمووی: خوا لێی دەبورێ و گەڕانەوەی لێ وەردەگرێ، گوتی: دەگەڕێتەوە سەری و گوناهەکە دووبارە ئەنجام دەداتەوە، فەرمووی: لەسەری دەنووسرێ، گوتی: داوای لێبوردنی لێ دەکاو دەگەڕێتەوە، فەرمووی: خوا لێی دەبورێ و گەڕانەوەی لێ وەردەگرێ، (دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) خوا بێزار نابێ (لە لێ خۆشبوونی بەندەکەی) تاکو ئەو بێزار دەبێ (لە داوای لێخۆش بوون کردن)!!**

---

(١) أَخرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط): ٨٦٨٩، والحَاكِمُ: ١٩٥، وَقَالَ: صَحيح عَلىَ شَرَطِ الشيخين وَلَمْ يخرجَاهُ.

**مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست!**

تاکە دوژمنی ڕوون و ئاشکرا کە خوای تعالی ڕاستەوخۆ ناوی هێنابێ و باسی کردبێ بریتیە لە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا، زۆر بە گرنگم زانی لەم بەشەدا باسی پەیوەندی شەیتان بە ئینسانەوە بکەم لە هەموو ئەو بوارانەی کە فەرموودەم لەسەری دەست دەکەوێ، لە سۆنگەی ئەوەشەوە بە گرنگی دەزانم ئەم بابەتە باس بکەین، چونکە ئینسان کە دوژمنی خۆی ناسی باشتر خۆی لێ دەپارێزێ، وە باشتر خۆی ئامادە دەکات بۆ بەرەنگار بوونەوەی، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە زانین و ناسینی خراپە، خراپ نیە، ئەگەر بۆ خۆ لـێ پاراستن بێت، وەک شاعیر دەڵێ:

عَرَفْتُ الشَّرَّ لاَ للشَّرِّ لَكِن لِأَتَّقِه        ومَنْ لَمْ يَعْرِفِ الشَّرَّ مِنَ النَّاسِ يَقَعْ فيه

خراپەم ناسی تاکو خۆمی لێ بپارێزم

هەرکەس خراپەی نێو خەڵك نەناسێ دەکەوتە نێوی

هەر یەک لە ئێمە دەربارەی مامەڵەی شەیتان لەگەڵ مرۆڤ پرسیار گەلێک لە زیهنماندا هەن، جا ئەوەی کە بە زیهنی من داهات لە کاتی نووسینی ئەم چەند لاپەڕە، ئەم پرسیارانە بوون:

لەکەیەوە شەیتان دەستی کردوە بە دوژمنایەتی مرۆڤ؟ ئایا کەس هەیە شەیتانی لەگەڵ نەبێ؟ ئایا شەیتان هەمیشە لەسەر چی هانمان دەدات؟ هەڵوێستی شەیتان لە کاتی بانگدان بۆ نوێژ؟ هەڵوێستی شەیتان لە کاتی سوجدەو کڕنووش بردن؟ ئایا شەیتانەکان دەتوانن زانیاریی لە فریشتە نزیکەکانی خوا بدزن؟ گومانەکانی شەیتان چین؟ ئایا دەزانی کە لە دەرگای ماڵ دەچیە دەر شەیتان لەگەڵتە بە چەترێکەوە تا دەگەڕێیەوە ماڵ؟ ئایا شەیتان بۆ وات لێ دەکات باوێشکت بێت؟ ئایا کە لە نێو نوێژی شەیتان چیت پێ دەڵێ؟ نابێ بە شەیتان بڵێی دەک لە ناوبچی؟ کامە شەیتان

**پلەو پایەی لە نێو شەیتانەکان زۆر گەورەیە؟ شەیتان لە چ مەجلیسێک دانانیشێ؟ شەیتان چ ماڵێک جێ دێڵێ و دەڕوات؟ چۆن خۆت لە شەیتان دەپارێزی بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین؟!**

**بۆ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە سەرنجی ئەم فەرموودە شیرینانەی خۆشەویستمان ﷺ دەدەین، کە زۆر بە ڕوونی نوقتەی بۆ خستووینە سەر پیت:**

**١١٨-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «ما مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ الشَّيْطَانُ يَمَسُّهُ حِينَ يُولَدُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخاً مِنْ مَسَّةِ الشَّيْطَانِ إِيَّاهُ، إِلاَّ مَرْيَمَ وَابْنَهَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَبُو هُرَيْرَةَ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾﴾ آل عمران»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ منداڵێک نیە کە لە دایک دەبێ مەگەر شەیتان دەستی خۆی لێ دەوەشێنێ، ئەو منداڵە قیژەو زیڕەیەکی لێ بەرز دەبێتەوە، جگە لە مەڕیەم و کوڕەکەی (واتە: عیسا عليه السلام) شەیتان نەیتوانیوە دەستیان لێ بوەشێنێ، پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئەگەر دەتانەوێ (زیاتر حاڵی بن) ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾﴾.**

**١١٩-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الجِنِّ، وَقَرِينُهُ مِنَ المَلاَئِكَةِ، قَالُوا: وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟! قَالَ: وَإِيَّايَ، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ، فَلا يَأْمُرُنِي إِلاَّ بِحَقٍّ»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کامێک لە ئێوە نیە مەگەر هاودەمێکی لە جن (شەیتان)و، هاودەمێکی**

---

(١) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٧٦٩٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٣٦٤٨، وَمُسْلِم: ٢٨١٤.

**لە فریشتان لەگەڵدایە، گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: منیش، بەڵام خوای گەورە یارمەتی منی داوە لەسەری، (واتە: مسوڵمان بووە) جگە لە هەق و ڕاستی هانم نادات و فەرمانم بە هیچ شتێکی دیکە پێناکات.**

**١٢٠-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ يا وَيْلَهُ «وَفِي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ يا وَيْلِي» أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ، فَلِيَ النَّارُ»}(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک ئادەمیزاد ئایەتی سەجدە دەخوێنێ و کڕنووش دەبات بۆ خوا، شەیتان دوور دەکەوێتەوەو دەگریێ، دەڵێ: هاوار بۆ من، ئادەمیزاد فەرمانی پێکرا بە کڕنووش بردن، کڕنووشی برد، بەوەش بەهەشتی مسۆگەر کرد، منیش فەرمانم پێکرا بە کڕنووش بردن سەرپێچیم کردو بەشم ئاگرە.**

**١٢١-** {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِنَّ لِلشَّيْطَانِ لَمَّةً بِابْنِ آدَمَ وَلِلمَلَكِ لَمَّةً، فَأَمَّا لَمَّةُ الشَّيْطَانِ فَإِيْعَادٌ بِالشَّرِّ وَتَكْذِيبٌ بِالحَقِّ، وَأَمَّا لَمَّةُ المَلَكِ فَإِيْعَادٌ بِالخَيْرِ وَتَصْدِيقٌ بِالحَقِّ، فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَعْلَمْ أَنَّهُ مِنَ اللّٰهِ فَلْيَحْمَدِ اللّٰهَ، وَمَن وَجَدَ الأُخْرَى فَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمْ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ... ﴿٢٦٨﴾ ﴾البقرة»}(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەوەی ئادەم هاندەرێکی شەیتانی و هاندەرێکی فریشتەیی**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٧١١، وَمُسْلِم: ٨١، وَابْنُ مَاجَه: ١٠٥٢، وَابْنُ حِبَّان: ٢٧٥٩.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٢٩٨٨، ضَعَّفَهُ الألباني فِي (ضعيف الجامع): ١٩٦٣، وفِي (المشكاة): ٧٤، ثُمَّ صَحَّحَهُ فِي هداية الرواة، (النصيحة: ٣٤) صحيح موارد الظمآن: ٣٨.

هەیە[1] هاندانی شەیتان بریتیە لە هەڕەشە لێکردنی بە خراپە کە بڕوا بە هەق نەهێنێ و بە درۆی بزانێ، بەڵام هاندانی فریشتە بریتیە لەوەی کە بەڵێنی پێ دەدا بە چاکە، وە هانیشی دەدا کە بڕوا بە هەق بێنێ، جا هەرکەس ئەوەی بینی لە (دڵیداو) هەستی پێکرد ئەوە با بزانێ لە خواوەیەو لە ڕێی فریشتەکانەوەیە، وە با ستایشی خوای لەسەر بکات، وە هەرکەس هەستی بە هاندەرەکەی تر کرد، ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ... ﴿٢٦٨﴾﴾ البقرة.

١٢٢- [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «عن إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ، وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى النِّدَاءَ أَقْبَلَ، حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، يَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا اذْكُرْ كَذَا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى»][2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک بانگ دەدرێ بۆ نوێژ، شەیتان پشت هەڵدەکاو ڕادەکات، (بە دەنگی بەرز) بای لێ دێتەدەر، تاکو گوێی لە بانگەکە نەبێ، کاتێک بانگەکە تەواو بوو دێتەوە، تاوەکو کاتێک قامەت دەکرێ بۆ نوێژ، (دووبارە) شەیتان پشت هەڵدەکات ڕادەکات، دواتر کە قامەت تەواو بوو (نوێژ دەستی پێکرد) دووبارە دێتەوە، تاوەکو وەسوەسە بخاتە نێوان نوێژخوێن و نەفسی، دەڵێ: بیر لەو شتە بکەوە، بیر لەو شتە بکەوە، ئەو شتانەی بیر دەخاتەوە کە لە بیری نەبووە، تا کەسەکە وای لێ دێت نازانێ چەند ڕکاتی کردوە.

---

(١) هەم شەیتان هانی دەداو هەم فریشتەش هانی دەدات.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٨٣، وَمُسْلِم: ٨٨٥.

**١٢٣-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ المَلَائِكَةَ تَنْزِلُ فِي العَنَانِ «وَهُوَ السَّحَابُ» فَتَذْكُرُ الأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ، فَيَسْتَرِقُ الشَّيْطَانُ السَّمْعَ، فَيَسْمَعُهُ، فَيُوحِيَهُ إِلَى الكُهَّانِ، فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فریشتەکان لە نێو هەور دادەبەزن، باسی شتێک دەکەن کە لە ئاسمان بڕیاری لەسەر دراوە، شەیتانەکانیش بە دزی گوێ لە فریشتەکان دەگرن، ئەم وشەیە دەبیستن، ئنجا بۆ کاهینەکان و جادووگەرو فاڵچیەکانی باس دەکەن، ئەوانیش سەد درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن لەلایەن خۆیانەوە.**

**تێبینی: کەواتە: دەگونجێ هەندێ جار قسەی کاهین و فاڵچیەکان ڕاست دەربچێ، لەبەر ئەوەی لەلایەن فریشتەکان باسکراوەو شەیتانەکان دزیویانە، بەڵام زۆری درۆ لەگەڵ تێکەڵ دەکەن، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی زانیارییەکە زۆر کەمە بەش ناکات، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ نین، پشتیان پێ نابەسترێ.**

**١٢٤-** {عَنْ سَبْرَةَ بْنِ أَبِي فَاكِهٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لِابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِهِ، فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الإِسْلَامِ، فَقَالَ لَهُ: أَتُسْلِمُ وَتَذَرُ دِينَكَ، وَدِينَ آبَائِكَ؟ قَالَ: فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ، ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: أَتُهَاجِرُ وَتَذَرُ أَرْضَكَ وَسَمَاءَكَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الْفَرَسِ فِي الطِّوَلِ، قَالَ: فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ، قَالَ: ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْجِهَادِ، فَقَالَ لَهُ: هُوَ جَهْدُ النَّفْسِ، وَالْمَالِ فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ فَتُنْكَحُ الْمَرْأَةُ، وَيُقَسَّمُ الْمَالُ، قَالَ: فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ»}[٢].

---

**(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٣٠٣٨**

**(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦٠٠٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، وَالنَّسَائِي: ٣١٣٤، صَحَّحَهُ الألباني.**

**واتە: سەبرەی کوڕی ئەبو فاکیهـ ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: شەیتان بۆ نەوەی ئادەم (مرۆڤ) لەسەر ڕێگەکانی دانیشتووەو، سەرەتا لەسەر ڕێی ئیسلامەتی بۆی دانیشتووە، کە هەر نەهێڵێ بێتە نێو ئیسلام، پێی دەڵێ[1]: ئایا مسوڵمان دەبی ئایینی خۆت و ئایینی باب و باپیرانت واز لێ دەهێنێ؟ (ئەو کەسە ئەگەر خوا هیدایەتی بدات، خۆشی خاوەن هەڵوێست بێ، هەڵناخەڵەتێ بە شەیتان و) سەرپێچی لە شەیتان دەکات و مسوڵمان دەبێ، دوایی لەسەر ڕێی کۆچ کردندا بۆی دادەنیشێ[2]، پێی دەڵێ: ئایا کۆچ دەکەی و نیشتیمانی خۆت و ئاسمانی خۆت بەجێ دێڵی؟ وە کۆچکەر وەک ئەسپێک وایە، کە بە پەتێک بەسترابێتەوە بۆ لەوەر بێت و بچێ (ئایا کۆچ دەکەی؟) (دیسان ئەو کەسە ئەگەر خوا هیدایەتی بدات)، سەرپێچی لە قسەی شەیتان دەکاو کۆچ دەکات، دوایی لە ڕێگای جەنگ و جیهاد بۆی دادەنیشێ، کە بریتیە لەوەی ئینسان ماڵ و نەفسی خۆی لە پێناوی خوادا ببەخشێ، ئیبلیس بە وەسوەسە پێی دەڵێ: ئایا جەنگ دەکەی دوایی بکوژرێی و ژنەکەت مارە بکرێتەوەو ماڵەکەشت دابەش بکرێ بەسەر میراتگراندا؟ (هەروەها ئەو کەسە ئەگەر خوا یارمەتی بدات) سەرپێچی لە قسەی شەیتان دەکات، لە ڕێگای خوادا جەنگ و جیهاد دەکات.**

**١٢٥-** [عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عنْها)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لنْ يَدَعَ الشَّيْطَانُ أَنْ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فَيَقُول: مَنْ خلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ؟ فَيَقُولُ: اللَّهُ فَيَقُولُ: فَمَنْ خلقَكَ؟ فَيَقُولُ: اللَّهُ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ اللَّه؟ فَإِذَا حَسَّ أَحَدُكُمْ بِذَلِكَ فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ وَبِرُسُلِهِ»][3].

---

(١) واتە: دەیخاتە نێو دڵی و وەسوەسەی بۆ دەکات کە کەسێك نامسوڵمانە دێتە نێو ئیسلام.

(٢) واتە ئەگەر پێویست بکات ئەو ئینسانە لەو شوێنە کۆچ بکات بچێ بۆ شوێنێك مسوڵمانێتی و دینداری خۆی بکات، جاری وا پێویست دەکات ئینسان نیشتیمان و ماڵ و حاڵی خۆی بەجێ بێڵێ، ئەگەر کۆچ کردن هاتە پێش.

(٣) أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّان: ١٥٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان واز لە یەکێکتان ناهێنێ تا دێتە لای، (یانی: دێتە خەیاڵی و وەسوەسەی بۆ دەکات)، پێی دەڵێ: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون؟ ئەویش دەڵێ: خوا، دەڵێ: ئەدی کێ تۆی دروست کردوە؟ دەڵێ: خوا، دەڵێ: ئەدی کێ خوای دروستکردوە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:) ئەگەر یەکێک لە ئێوە هەستی بە شتێکی وا کرد، با بڵێ: بڕوام بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هێناو. (تەواو، کۆتایی پێ بێنێ، چونکە ئەوە شەیتانە دەیەوێ گومڕای بکات و گومانی بۆ لە خوای گەورە دروست بکات).**

**١٢٦-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ، يَعْنِي مِنْ بَيْتِهِ، إِلاَّ بِيَدِهِ رَايَتَانِ: رَايَةٌ بِيَدِ مَلَكٍ، وَرَايَةٌ بِيَدِ شَيْطَانٍ، فَإِنْ خَرَجَ لِمَا يُحِبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، اتَّبَعَهُ الْمَلَكُ بِرَايَتِهِ، فَلَمْ يَزَلْ تَحْتَ رَايَةِ الْمَلَكِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ، وَإِنْ خَرَجَ لِمَا يُسْخِطُ اللَّهَ، اتَّبَعَهُ الشَّيْطَانُ بِرَايَتِهِ، فَلَمْ يَزَلْ تَحْتَ رَايَةِ الشَّيْطَانِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ»}[١].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە کە لە ماڵ دێتە دەرەوە دوو ئاڵای لەگەڵدایە، ئاڵایەکیان بە دەست فریشتەیەکە، ئاڵایەکیش بە دەستی شەیتانێکەوەیە، جا ئەگەر بۆ شتێک چووە دەر لە ماڵ کە خوای زاڵی پایەدار پێی خۆش بوو، ئەوە فریشتەکەی شوێنی دەکەوێ بە ئاڵاکەیەوە، بەردەوام لە ژێر ئەو ئاڵایەی فریشتەکە دەبێ تا دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی، وە ئەگەر چووە دەر لە ماڵ بۆ شتێک کە خوا پێی ناخۆش بێ، ئەوە شەیتانەکە شوێنی دەکەوێ بە ئاڵاکەیەوە، ئیتر دەگەڕێتەوە ماڵ بەردەوام لە ژێر ئەو ئاڵایەی شەیتانەکەدا دەبێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٢٦٩، قال أَحْمَد شاكر: إِسْنَادُهُ صَحِيح، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

**١٢٧-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ؓ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، قَالَ: يُقَالُ حِينَئِذٍ: هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ، فَيَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ فَيَقُولُ لَهُ شَيْطَانٌ آخَرُ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ»}[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ؓ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک لە ماڵ بێتە دەرو بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) واتە: خوایە پشتم بە تۆ بەست و هیچ لادانێک (لە ئافات و تاوان نیە) وە هیچ توانایەک (بۆ ئەنجامدانی چاکە) نیە حەتمەن خوای زاڵی خاوەن توانا دەیبەخشێت، ئەوە لەو کاتەدا پێ دەگوترێ: هیدایەت درایت و کیفایەت کرایت و پارێزرایت، وە شەیتانەکەی خۆی لێ دوور دەخرێتەوە، جا شەیتانێکی دیکە (بە شەیتانەکەی کەسەکە) دەڵێ: تۆ چ دەستەڵاتێکت هەیە بەسەر کەسێکدا کە هیدایەت درابێ و کیفایەت کرابێ و پارێزرابێ؟!.**

**١٢٨-** {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: مَا خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ بَيْتِي قَطُّ إِلاَّ رَفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمْ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»}[2].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ کاتێک نەبووە پێغەمبەر ﷺ بچێتە دەر لە ماڵ حەتمەن ڕووی دەکردە ئاسمان و دەیفەرموو: خوایە پەنات پێدەگرم لەوەی خەڵک گومڕا بکەم، یان گومڕا بکرێم، هەڵە بکەم یان هەڵەم لەگەڵ بکرێ، ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێ، یان نەفامیی بکەم یان نەفامییم لەگەڵ دا بکرێ.**

---

(١) أَخرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٥٠٩٥، والنَّسَائِي فِي الكبرى: ٩٩١٧، وَابْنُ حِبَّان: ٨٢٢، انظر: (صحيح الجامع): ٤٩٩.

(٢) أَخرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٥٠٩٦، انظر: (المشكاة): ٢٤٤٢.

**١٢٩-** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فِيهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ»}[1].

**واته: ئەبو سەعیدی خودریی  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات، با دەست بخاتە سەردەمی، چونکە شەیتان دەچێتە نێوی.**

**١٣٠-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ  عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ، فَحَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُشَمِّتَهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِذَا قَالَ: هَا، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ»}[2].

**واته: ئەبو هورەیرە  دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا پژمینی خۆش دەوێ و ڕقی لە باوێشکە، (چونکە پشمین خراپەو زیان دەکاتە دەرەوە، بەڵام باوێشک خراپەو تەنبەڵی دروست دەکات)، ئەگەر یەکێک لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، لەسەر هەر کەسێکە کە لەوێیەو گوێی لێیە، پێویستە پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللّٰه) خوا بەزەیی پێتدابێت، بەڵام باوێشک بە دڵنیایی لە شەیتانەوەیە، (شەیتان پێی خۆشە ئینسانی مسوڵمان بێ تاقەت بێ، بێزار بێ، ماندوو بێ، بۆیە دەفەرموێ:) ئەگەر یەکێک لە ئێوە، باوێشکی هات با بەپێی توانا بیگرێتەوە، (دەستی لەسەر دەمی دابنێ)، چونکە یەکێک لە ئێوە کە باوێشک دەدا دەڵێ: ئاااا، شەیتان پێی پێدەکەنێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٩٩٥.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٥٢٦، والبُخَارِي: ٥٨٦٩، وَأَبُو دَاوُد: ٥٠٢٨.

١٣١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْتِي أَحَدَكُمْ الشَّيْطَانُ، وَهُوَ فِي صَلاَةٍ، فَيَقُولُ: أَذْكُرْ كَذَا، أَذْكُرْ كَذَا حَتَّى شَغَلَهُ، وَلَعَلَّهُ أَنْ لاَ يَعْقِلَ، وَيَأْتِيهِ فِي مَضْجَعِهِ فَلاَ يَزَالُ يُنَوِّمُهُ حَتَّى يَنَامَ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان دێتە لای یەکێکتان کە ئەو لە نێو نوێژ کردنە، پێی دەڵێ: بیر لەوە بکەرەوە، بیر لەوە بکەرەوە، هەتا سەرقاڵی دەکات، ئەمەش بە ئومێدی ئەوە دەکات ئاگای لە نوێژەکەی نەمێنێ و نەزانێ چ دەڵێ، ئنجا کاتێ ئەو کەسە دەڕواتە سەر جێگاکەی بۆ خەوتن، ئەوە شەیتان بەردەوام خەریکی خەواندنیەتی تا بیخەوێنێ بۆ ئەوەی ئەزکارەکان نەخوێنێ!**

**تێبینی: ئەوە مەرج نیە بۆ هەموو کەسێک وابێ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کاتێک مسوڵمانێک دەیەوێ زاری تەڕ بکات بە زیکرو یادی خوای گەورەو، بە دەم خوێندنی دوعاو پاڕانەوەکانەوە بخەوێ شەیتان ڕێگە نادات ئەم زیکرو پاڕانەوانە ئەنجام بدات، تا وای لێدەکات باوێشکی بێتێ و بیخەوێنێ، بەڵام کەسانێکی دی کە تا نوێژی بەیانی خەریکی شتی تافهو بێ مانان و بێ کەڵکن، بەڵکو بگرە بە پێچەوانەوەش خەریکی شتی زیان بەخشن بە دینیان بە ڕەوشتیان، ئەوە شەیتان نەک دەیانخەوێنێ، بەڵکو ناشت و چالاکیان دەکات بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر ئەو کارە ناپەسندانە، بۆ ئەوەی بێ ئاگاو غافڵ بن لە زیکرو یادی خوای متعال.**

---

(١) أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّان: ٢٠١٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

## فێڵی شەیتان تەواو نابێ!

دەڵێن: جارێک پیاوێک لە ژێر دیوارێک دانیشتوە، دیوارەکە خەریک دەبێ دابکەوێ و بڕوخێ، کەسێک لەولا ڕا دێ بە پەلە، کابرای بن دیوار ئاگادار دەکاتەوە لە ڕووخانی دیوارەکەو، کابرا لادەکەوێ و دیوارەکە دەڕوخێ.. کابرا زۆر سوپاسی ئەو پیاوە دەکات کە هەواڵی پێداوەو ڕزگاری کردوە لە مردن.. ئەویش دەڵێ: هیچ سوپاسم مەکە، من بۆ خۆم وام کرد، خەمی تۆم نەبوو..

دەڵێ: بۆ تۆ کێ ی؟ دەڵێ: من شەیتانم، ئەگەر تۆ بکەوتایەتە ژێر ئەم دیوارە شەهید دەبووی، ویستم ئەو پلە گەورەت بە قسمەت نەبێ و شەهید نەبیت!

**١٣٢-** [عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ فَعَثَرَتْ دَابَّتُهُ، فَقُلْتُ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: «لا تَقُلْ تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلتَ ذَلِكَ، تَعَاظَمَ حَتَى يَكُونَ مِثلَ البَيتِ، وَيَقُولُ: بِقُوَّتِي، وَلَكِن قُلْ: بِسْمِ اللَّهِ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلتَ ذَلِكَ، تَصَاغَرَ حَتَّى يَكُونَ مِثلَ الذُّبَابِ»][1].

واتە: ئەبو مەلیح دەگێڕێتەوە لە هاوەڵێکەوە، دەڵێ: من لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئاژەڵەکەی بوو بووم، ئاژەڵەکەی کەوت، یان کۆسپی کەوتە پێش، منیش گوتم: ئەی شەیتان لە ناوبچێ، پێی فەرمووم: مەڵێ: شەیتان لە ناوبچێ، چونکە ئەگەر تۆ وا بڵێی، ئەوە خۆی پێ گەورە دەبێ هەتا هێندەی خانووێکی لێ دێ، وە دەشڵێ: ئەوە بەهێزو توانای خۆم وام، بەڵام بڵێ: (بسم الله)، چونکە ئەگەر وات گوت: بچووک دەبێتەوە هەتا هێندەی مێشوولەکەیەکی لێ دێت.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٤٩٨٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

**١٣٣-** {عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَبْعَثُ الشَّيْطَانُ سَرَايَاهُ فَيَفْتِنُونَ النَّاسَ، فَأَعْظَمُهُمْ عِنْدَهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً»}[1].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: شەیتان (ی گەورە) سوپای خۆی دەنێرێ بۆ ئەوەی فیتنەو ئاشووب لە نێو خەڵکدا دروست بکەن، ئەو شەیتانەی فیتنەو ئاشووبی گەورە دەنێتەوە پلەو پایەی لە هەمووان گەورەترە.**

**١٣٤-** {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللَّه عِنْدَ دُخُولِه، وَعِنْدَ طَعَامِه، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِه، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّه عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ»}[2].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کە بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس کە دەچێتەوە ماڵ، ناوی خوای هێنا لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نان خواردن، شەیتانە گەورەکە بە شەیتانەکانی دیکە دەڵێ: ئێرە جێگای مانەوەی ئێوە نیە، وە لە هیچ خواردن و خۆراکێکی بەشی ئێمە نەماوە، بەڵام ئەگەر چووە ژوورەوە ناوی خوای نەهێنا، وە لە کاتی نان خواردن ناوی خوای نەهێنا، شەیتانە گەورەکە دەڵێت شوێنی مانەوەو خواردنتان دەستکەوت.**

**١٣٥-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَداً»}[3].

---

**(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٨١٣.**

**(٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٠١٨.**

**(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٩٦١.**

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانی (لەگەڵی جووت بێت) ئەوە لە کاتی جووتبوونیدا با بڵێت: بە ناوی خوا، ئەی خوایە شەیتانمان لێ دوور بگرە، وە شەیتان لەوە دوور بگرە کە پێمان دەبەخشی، ئەوە ئەگەر منداڵیان ببێ بە هۆی ئەو جووتبوونەوە، هیچ کاتێ شەیتان ناتوانێ زیانی لێبدات.**

**١٣٦-** [عن صفيّة بنت حيي (رضي الله عنها) قالت: كان النبيّ ﷺ معتكفا، فأتيته أزوره ليلا، فحدّثته، ثم قمت لأنقلب، فقام معي ليقلبني، وكان مسكنها في دار أسامة بن زيد، فمرّ رجلان من الأنصار فلمّا رأيا رسول الله أسرعا، فقال النبيّ ﷺ: «على رسلكما، إنّها صفيّة بنت حييّ»، فقالا: سُبحانَ اللّهِ يا رَسُولَ اللّهِ ﷺ! فَقالَ: «إنَّ الشَّيْطانَ يَجْري مِنْ ابْنِ آدَمَ مجرَى الدّمِ، وإنِّي خَشِيتُ أنْ يقْذفَ في قُلُوبِكُما شرّاً- أوْ قالَ شَيْئاً»][1].

**واتە: صەفیەی کچی حویەی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی کردبوو، منیش بە شەو چووم سەردانم کرد، قسەم لەگەڵ کرد، پاشان هەڵسام تا بگەڕێمەوە، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵم ڵهەسا تا وەکو بەڕێم بکات، کە شوێنی نیشتە جێ بوونی (ماڵی صەفیە) لەو شوێنە بوو (کە دواتر بوو) بە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید، لەو کاتەدا دوو پیاو لە ئەنصارەکان بەوێدا تێپەڕین، کاتێک پێغەمبەریان ﷺ بینی خێراتر ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: بە هێواشی بڕۆن (هیچ هۆکارێک نیە تا خێرا بڕۆن)، ئەوە صەفیەی کچی حویەیە (کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ)، گوتیان: پاکو بێگەردی بۆ خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! (چۆن گومانی خراپ بە تۆ دەبەین؟!) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: شەیتان لە ناخ و جەستەی ئادەمیزاددا دێت و دەچێ وەک چۆن خوێن**

---

(١) أخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٠٣٥، وَمُسْلِم: ٢١٧٥.

**دێت و دەچێ، وە من لەوە ترسام کە شتێک (گومانێکی خراپ) لەدڵتاندا دروست بێ.**

**١٣٧-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: خَطَبَنَا عُمرُ ﷺ بِالْجَابِيَةِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنِّي قُمْتُ فِيكُمْ كَمَقَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِينَا فَقَالَ: «أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَفْشُو الْكَذِبُ، حَتَّى يَحْلِفَ الرَّجُلُ وَلَا يُسْتَحْلَفُ، وَيَشْهَدَ الشَّاهِدُ وَلَا يُسْتَشْهَدُ، أَلَا لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ، عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الِاثْنَيْنِ أَبْعَدُ مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمْ الْجَمَاعَةَ مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وَسَاءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَذَلِكُمُ الْمُؤْمِنُ»}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر ﷺ وتاری بۆ داین لە جابیە (شوێنێکە)، گوتی: ئەی خەڵکینە! من لە نێوتاندا وەستاوم، لە شوێنی وەستانی پێغەمبەری خوا لە نێوماندا، جا فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم بە شوێنکەوتنی هاوەڵانم، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان دێن، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان دێن، دواتر (پاشی ئەوان) درۆ زۆر دەبێت و بڵاودەبێتەوە، تا وای لێ دێت مرۆڤ سوێند دەخوات لەکاتێکدا داوای سوێند خواردنی لێ نەکراوە، وە شاهێدی دەدات داوای شاهێدی لێ نەکراوە، ئاگادار بن هیچ پیاو و ئافرەتێک نیە بە تەنها بن حەتمەن شەیتان سێهەمیانە، لەگەڵ کۆمەڵدابن کۆمەڵی مسوڵمانان، وە خۆتان لە پەرتەوازەیی بپارێزن، چونکە شەیتان لەگەڵ یەک نەفەرە، بەڵام لە دووان دوورترە[2]، وە هەر کەسێک بیەوێ بچێتە نێوەڕاستی بەهەشتێ با لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانان دابێ، هەر کەسێک چاکەکانی دڵ خۆشی بکەن و خراپەکانی دڵ تەنگی بکەن ئەوە بڕوادارە.**

---

(١) أَخرَجَهُ التِّرمِذِي، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيب، وَالحَاكِمُ: ٣٨٧.

(٢) یەك کەس دەگونجێ شەیتان لەگەڵی بێ، ڕێی لێ تێکبدات، بەڵام کە بوونە دوو لێیان دووردەکەوێتەوە، چونکە ئامۆژگاری یەکدی دەکەن.

## چۆنیەتی خۆپاراستن لە شەیتان؟

**١٣٨-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلُ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە بە ئەندازەی ئازاد کردنی کۆیلەیەک چاکەی دەست دەکەوێ، وە سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە سەد گوناهی لێ دەسڕێتەوە، وە لە شەیتانیش دەپارێزرێ ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە دادێ، وە کەس بە پاداشتی لەو چاکتر نایێ (لەو ڕۆژەدا) مەگەر کەسێک لەو زیاتر (ئەو زیکرە) بکات.**

**١٣٩-** {عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ قَالَ: لَقِيتُ عُقْبَةَ بْنَ مُسْلِمٍ فَقُلْتُ لَهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ حَدَّثْتَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَالَ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»، قَالَ: أَقَطْ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ قَالَ الشَّيْطَانُ: «حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ»}[2].

**واتە: حەیوەی کوڕی شورەیح دەڵێ: گەیشتم بە عوقبەی کوڕی موسلیم پێمگوت: بیستوومە کە تۆ (قسەیەکت) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی**

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٦٤٠٥، وَمُسْلِم: ٢٦٩١.
(٢) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٤٦٦، وَصَحَّحَهُ الألباني.

کوڕی عاص ﷺ گێڕاوەتەوە: کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەیویست بچێتە نێو مزگەوت دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، (عوقبەی کوڕی موسلیمیش) دەڵێ: هەر ئەوەندەت بیستوه لە من؟ دەڵێ: بەڵێ، ئەویش وتی: دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێک وا بڵێ: ئەوە شەیتان دەڵێ: ئەو کەسە بە درێژایی ئەم ڕۆژە لە من پارێزراوەو ناتوانم زەفەری پێ ببەم.

## دەربارەی: فەرمان بە چاکەو قەدەغەی خراپە

**١٤٠-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەمووتان چاودێرن، هەرهەمووشتان بەرپرسن لەسەر چاودێریەکەتان.**

**١٤١-** {عَنْ الْعُرْسِ ابْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الأَرْضِ كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا[2] كَمَنْ غَابَ عَنْهَا، وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا»}[3].

**واتە: عورسی کوڕی عەمیرەی کیندی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوناهو ئاشووب لە شوێنێک ئەنجامدرا، ئەو کەسەی کە لەوێ بووەو بینیویەتی و پێی ناخۆشە، وەک ئەوە وایە لەوێ ئامادە نەبووبێ، وە ئەو کەسەی لەوێ ئامادە نیە، بەڵام پێی خۆشەو پێی ڕازیە وەک ئەمە**

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٢٧٨، وَمُسْلِم: ١٨٢٩.

(٢) وَقَالَ مَرَّةً: «أَنْكَرَهَا».

(٣) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٤٣٤٥، وَحَسَّنَهُ الألباني.

**وایە لەوێ بێ (واتە: مادام پێی خۆشەو پێی ڕازیە بەم ئاشووب نانەوەیە، ئیتر وەک ئەمە وایە ئەنجامی دابێ).**

**١٤٢-** {عَنْ قَيْسٍ قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴿١٠٥﴾ ﴾المائدة، وَإِنَّا سَمِعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ، أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللَّهُ بِعِقَابِهِ»}[١].

**واتە: قەیس دەڵێ: ئەبوبەکر ﷺ هەستا (بۆ وتاردان)و سوپاس و ستایش و سەنای خوای کرد، پاشان گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴿١٠٥﴾ ﴾المائدة، وە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیگوت: هەرکاتێک خەڵک ستەمکاریان بینی، دەستیان نەگرت بیگێڕنەوە لەو ستەمە، ئەوە زۆر نزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەک بنێرێ بۆ هەموویان.**

**١٤٣-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مُرُوا بِالْمَعْرُوفِ، وَانْهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، قَبْلَ أَنْ تَدْعُوا فَلاَ يُسْتَجَابَ لَكُمْ»}[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن، پێش ئەوەی دوعا بکەن و بپاڕێنەوەو وەڵامتان نەدرێتەوە.**

**١٤٤-** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَسْأَلُ الْعَبْدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَسْأَلُهُ، يَقُولُ: أَيْ عَبْدِي! رَأَيْتَ مُنْكَراً فَلَمْ تُنْكِرْهُ، فَإِذَا لَقَّنَ اللَّهُ عَبْداً حُجَّتَهُ، قَالَ: يَا رَبِّ! وَثِقْتُ بِكَ، وَخِفْتُ النَّاسَ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٣٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَىَ شَرطِ الشَّيْخَيْنِ.

(٢) أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَهْ: ٤٠٠٤.

(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١١٧٥٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز لە ڕۆژی دوایی پرسیار لە بەندەکان دەکات، هەتا ئەو پرسیارەشی لێ دەکات و پێی دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم! بۆچی خراپەت بینی و ڕێگریت لێ نەکرد (و هەڵوێستت نەبوو)؟ جا ئەگەر خوا ژیریی و بەڵگە بەم بەندەیە ببەخشێ، ئا لەو کاتەدا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! متمانەم بە لێبوردەیی تۆ هەبوو، وە ترسم لە خەڵک هەبوو.**

**١٤٥-** {عنْ حُذَيْفَة ﷛ قَال: قَال رسُولُ اللَّه ﷺ: «لاَ يَنْبَغِي للمُؤْمِن أَنْ يُذِلَّ نَفْسهُ، قَالُوا: وكَيْف يُذِلُّ نَفْسهُ؟ قَال: يَتَعَرَّضُ منَ الْبلاءِ لمَا لاَ يُطِيقُ»}[1].

**واتە: حوزەیفە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناگونجێ بۆ کەسی ئیماندار خۆی تووشی زەلیلی و ژێردەستەیی بکات، گوتیان: ئایا چۆن خۆی تووشی زەلیلی و ژێردەستەیی دەکات؟ فەرمووی: خۆی ڕانوێنێ بۆ ئیش و کارو بەڵاو تاقیکردنەوەیەک کەچی توانای خۆگرتنیشی نەبێ و لە ژێری دەرنەچێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٣٤٩١، والتِّرْمِذِي: ٢٢٥٤، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٤٠١٦، انظر: (المشكاة): ١٥٧.

## باشترین ئافرەت کامەیە؟

**١٤٦-** {عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ النِّسَاءِ امْرَأَةٌ إِذَا نَظَرْتَ إِلَيْهَا سَرَّتْكَ، وَإِذَا أَمَرْتَهَا أَطَاعَتْكَ، وَإِذَا غِبْتَ عَنْهَا حَفِظَتْكَ فِي نَفْسِهَا وَمَالِكَ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئافرەت ئافرەتێکە ئەگەر تەماشات کرد پێی دڵخۆشبی، وە کە فەرمانت پێکرد گوێڕایەڵت بکات، وە ئەگەر لە لای نەبووی بتپارێزێ لە نەفسی خۆی (ئاگاداری حەیاو ناموسی خۆی بێ)[٢]، وە ماڵەکەت بپارێزێ و (زێدەڕۆیی نەکات لە ماڵ سەرف کردن).**

## پلک و پووری خێزان مارە ناکرێن

**١٤٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ ئافرەت بەسەر خوشکی بابی یان بەسەر خوشکی دایکی بهێنرێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ الطيالسي: ٢٣٢٥، والديلمي: ٢٩١٢، وَالبزار: ٨٥٣٧ واللَّفظُ لَهُ.

(٢) شتێك نەكات كە گوناهبار بێ و سومعەو ئابڕووی خۆی و مێردەكەی لەكەدار بكات.

(٣) أَخْرَجَهُ مالك: ١١٠٨، والبُخَارِي:٤٨٢٠، وَمُسْلِم: ١٤٠٨.

## باشترین پیاو کێیە؟

١٤٨- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِلنِّساءِ»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین (پیاو)تان، چاکترینتانە بۆ ئافرەتان.**

## ئازاردرانی پیاو لەلایەن ئافرەت

١٤٩- {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوجَهَا إِلاَّ قَالَتْ زَوَجَتُهُ مِنَ الحُورِ العِينِ: لا تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللّهُ! فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكِ دَخِيلٌ أَوْشَكَ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَينَا»}[2].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ ئافرەتێک نیە کە مێردەکەی ئازار بدات، حەتمەن ئەو ئافرەتە حۆریەی کە لە بەهەشت بۆی دانراوە (دوعای لێدەکات و) دەڵێ: ئازاری مەدە ئەی خوا بتکوژێ! ئەوە تەنها لەلات میوان و سپاردەیە، زۆر نزیکە لێت جیابێتەوەو بێتەوە لای ئێمە.**

(١) أخرَجَهُ الحَاكِمُ: ٧٣٢٧، وقال: صحيح الإسناد، انظر: (صحيح الجامع): ٣٣١٦.

(٢) أخرَجَهُ ابْنُ مَاجَه: ٢٠١٤، قال الألباني: صحيح.

## رێگەدان بە چوونی ئافرەت بۆ مزگەوت

١٥٠- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ أَنْ يُصَلِّينَ فِي الْمَسْجِدِ». فَقَالَ ابْنٌ لَهُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ، فَقَالَ: فَغَضِبَ غَضَباً شَدِيداً، وَقَالَ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَقُولُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ؟}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕێ بە ئافرەتان مەگرن لەوەی بیانەوێ نوێژ لە مزگەوت بکەن، (دیارە) یەکێک لە کوڕەکانی ئیبنو عومەر (لەوێ ئامادەبوو) گوتی: ئێمە ڕێیان لێ دەگرین (بۆ مزگەوت)، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر زۆر بە توندی تووڕە بوو (کە گوێ بیستی ئەم قسەیە بوو) گوتی: من فەرموودەی پێغەمبەرت ﷺ بۆ دەگێڕمەوە، کەچی تۆ دەڵێی: ئێمە ڕێگایان پێ نادەین؟ (دەبێ زۆر بە ڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ فەرمایشتەکانی رسول اللّه ﷺ بکەین، وە ڕێ بە ئافرەتانیش بدرێ بۆ چوونە مزگەوت).**

## ئافرەت دەبێ بە تەنگ داوای مێردی بچێ

١٥١- {عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ، فَلْتُجِبْهُ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ»}[2].

**واتە: تەڵقی کوڕی عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو (مێرد) داوای سەرجێی (واتە: جووتبوونی) کرد لە ژنەکەی، ئەوە پێویستە ژنەکەی بە تەنگ داواکەی بچێ، ئەگەر لەو کاتەدا لەسەر**

---

(١) أَخْرَجَهُ مسلم: ٤٤٢.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي ١١٦٠، والنَّسَائِي في الكبرى: ٨٩٧١، وابن حبان: ٤١٦٥، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

**تەنووری نان دروست کردنیش بێت (واتە: هەتا ئەگەر جگە لەو هیچ کەسی دی نەبوو ئەم کارە بکات و بچێتە شوێنی بۆ نان دروست کردن، حەتمەن دەبێ دەستبەرداری کارەکەی بێ و داوای مێردەکەی جێبەجێ بکات).**

**١٥٢-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لا يَحِلُّ لِلمرأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِه، وَلاَ تَأْذَنْ فِي بَيتِهِ إلاَّ بِإِذْنِه، وما أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَة عَنْ غَيرِ أَمْرِهِ فَإِنَّهُ يُؤَدِّي إِلَيه شَطْرُهُ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک ڕۆژوو (ی سوننەت) بگرێ و مێردەکەشی ئامادەبێ، مەگەر پیاوەکەی مۆڵەتی بدات، وە دروست نیە بانگی هیچ پیاوو ئافرەتێک بکات بۆ ماڵەکەی بێ مۆڵەتی پیاوەکەی، وە هەر شتێکیش ببەخشێ لە ماڵی پیاوەکەی بێ فەرمانی ئەو پیاوە، وە بە دڵنیایی نیوەی خێرو پاداشتەکە بۆ پیاوەکە دەبێ.**

## خراپترین ژن و مێرد کامانەن؟

**١٥٣-** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلُ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا»}[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خراپترینی خەڵکی لە لای خوا لە ڕۆژی دوایی پیاوێکە بۆ سەرجێی چۆتە لای ژنەکەی، وە ژنێکە بۆ سەرجێی چۆتە لای پیاوەکەی،**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٤٨٩٩.

(٢) أَخرَجَهُ مُسْلِم: ١٤٣٧.

**پاشان دێ بۆ خەڵکی باس دەکات و بڵاوی دەکاتەوە (کە ئاواو ئاوای لەگەڵ هاوسەرەکەی کردوە).**



## هاوسەرگیریی نیوەی ئاین تەواو دەکات

**١٥٤-** {عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَزَوَّجَ العَبْدُ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ، فَلْيَتَّقِ اللَّه فِي النِّصْفِ البَاقِي»}[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک بەندە (کوڕ، یان کچ) هاوسەرگیریی کرد، ئەوە بە دڵنیایی نیوەی دینداریەکەی تەواو بووە، دەی با پارێز لەو نیوەی دیکە بکات کە ماوە.**

## کێ شایستەی کچ پێدانە؟

**١٥٥-** {عَنْ أَبِي حَاتِمٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! وَإِنْ كَانَ فِيهِ، قَالَ: «إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»}[2].

**واتە: ئەبو حاتەمی موزەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ کەسێک هاتە لاتان داوای کچەکەتانی کرد ئەگەر لە دینداریی و ڕەوشتەکەی ڕازی بوون، ئەوە کچەکەتانی پێبدەن، ئەگەر ئەم کارە نەکەن ئەوە خراپەکاریی و ئاشووب لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوەو خراپەیەکی زۆر**

---

(١) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان): ٥٤٨٦، انظر: (صحيح الجامع): ٤٣٠.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ١٠٨٥، قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

دێته کایەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر تێیدا بوو (واته: ئەم دیندارو خاوەن ڕەوشتی بەرز بوو)، فەرمووی: هەر کاتێ کەسێک هاته لاتان داوای کچەکەتانی کرد ئەگەر لە دینداریی و ڕەوشتەکەی ڕازی بوون، ئەوە کچەکەتانی پێبدەن، سێ جاران ئەمەی دووباره کردەوە).

## مۆڵەت لە کچ وەردەگیرێ پێش بە شوودانی

**١٥٦-** {عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَزَوِّجَ ابْنَتَهُ فَلْيَسْتَأْمِرْهَا»}[1].

**واته: ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ویستی کچی بە شوو بدات، با پرسی پێ بکات و داوای مۆڵەتی لێبکات.**

## هاوسەرگیریی نیەتی پاکی دەوێ

**١٥٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُ: مَنْ نَكَحَ التِمَاسَ الْعَفَافِ عَمَّا حَرَّمَ اللَّهُ»}[2].

**واته: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لەسەر خۆی پێویست کردوە هاوکاری ئەو کەسە بکات کە هاوسەرگیری کردوە، بە مەبەستی داوێن پاکی و خۆپاراستن و دوورکەوتنەوەی لە حەرامکراوەکانی خوا.**

---

(١) أَخرَجَهُ أبو يعلى: ٧٢٢٩، انظر: (صحيح الجامع): ٣٠٠.

(٢) أَخرَجَهُ إبن عدي ج٧، ص٢٦٥، انظر: (صحيح الجامع): ٣١٤٦.

## پرۆسەی هاوسەرگیریی دەبێ ئاشکرا بێ

١٥٨- {عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ اَلزُّبَيْرِ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَعْلِنُوا النِّكَاحَ»}[1].

**واتە: عامرِی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ﷺ لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری ئاشکرا بکەن. (پێویستە مسوڵمان هاوسەرگیری بە ئاشکرا بکات و لە نێو خەڵکدا ڕایبگەیەنێ کە فڵانە کوڕ چۆتە داوای فڵانە کچەو ئیتر ئێستا بۆتە دەستگیرانی، بۆ ئەوەی خەڵک بزانێ کە ئەمانە هاوسەرگیریان کردوەو دواجار کێشەی دی لێ نەکەوێتەوە).**

## دادگەری لە نێوان دوو ژن

١٥٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ عِنْدَ الرَّجُلِ امْرَأَتَانِ، فَلَمْ يَعْدِلْ بَيْنَهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ سَاقِطٌ»}[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێک دوو ئافرەتی لەلا هەبن (واتە: خێزانی بن)، دادگەری نەنوێنێ لە نێوانیاندا، لە ڕۆژی دواییدا کە دێ لاربۆتەوەو لایەکی کەوتووە.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦١٧٥، وابن حبان: ٤٠٦٦، والحَاكِمُ: ٢٧٤٨، وقال: صحيح الإسناد، انظر: (صحيح الجامع): ١٠٧٢.

(٢) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ١١٤١، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ١٩٤٩.

## ئایا ژن دەتوانێ داوای تەڵاق بکات؟

١٦٠- {عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقاً مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الجَنَّةِ»}[١].

**واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر ژنێک بە ناهەق و بەبێ پاساوو بەڵگە داوا بکات لە مێردەکەی جیابێتەوە ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغەیە.**

**تێبینی:[٢] زانایان لێرە مشت و مڕیان هەیەو زۆربەیان دەڵێن: بۆی نیە داوای تەڵاق بکات مادام بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەبێ، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: بۆی هەیە. وە بە ڕاستی ڕای هەندێکیان بەهێزترە لە هی زۆربەیان ئەگەر ژنەکە هەر سوور بوو، بەڵێ گوناهبارە، بەڵام شەریعەت ئەو دەرفەتەی پێداوە، بۆچی؟! چونکە ئەگەر هەر سوور بوو، ئەو کاتە پیاوەکەش خۆشی لێنابینێ و ئەو ئافرەتەش ڕەنگە تووشی غەڵەت بێ، وە ئەگەر منداڵیشیان هەبێ منداڵەکانیش باجەکەی دەدەن.**

**کەواتە: تا زووتر لێک بترازێن باشترە، با ژنەکەش ناهەق بێ، بۆیەش ناهەقیەتی، چونکە کاتی خۆی کە مێردی بەو پیاوە کردوە، لەبەر چاوی بووە، چونکە تا ئافرەت بە خۆی ڕازی نەبێ ئارەزوومەند نەبێت مارەیی نایەت و مارە ناکرێ، کەواتە: کە ڕازیبووەو بە ئارەزووی خۆی بووەو لەبەر چاوی بووە، ئەدی ئێستا بۆچی لێی جیادەبێتەوە؟! بەڵێ، ئەگەر عەیبێکی هەبێ و لێی شاردبێتەوەو دوایی لێی دەربکەوێ، ئەو کاتە هەقیەتی، بەڵام کە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ و پیاوەکە هەر وەک**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢٤٣٣، وأبو داود: ٢٢٢٦، والتِّرْمِذِي: ١١٨٧، وابن ماجه: ٢٠٥٥، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ٢٠١٨.

(٢) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، سووڕەتی بەقەڕە، نووسینی: مامۆستا عەلی باپیر.

**جاران بێ کە کاتی خۆی بە دڵی خۆی شووی پێکردوەو ئێستا هەڵیدەپێچێ، ئەوە بە دڵنیایی گوناهبارە.**

**مامۆستا (عەلی باپیر) دەڵێ: بەڵام من پێم وایە ئەو ڕایە ڕاستە کە هەر بۆشی هەیە جیابێتەوە، چونکە جێدار (بدیل)ەکەی هەر چۆن بێ خراپترو زیانی پترەو بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئافرەت نەتوانێ داوای جیابوونەوە بکات لە پیاو بە تایبەت ئەگەر مەترسی لەسەر بەزاندنی سنوورەکانی خوا هەبوو، وەک لەم دەقەدا هاتوە:**

**١٦١-** {عنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ أَمَا إِنِّي مَا أَعِيبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إقْبَلِ الحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: خێزانی سابیتی کوڕی قەیس کوڕی شەماس، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە ڕووی ڕەوشتەوە نە لەڕووی دینەوە ڕەخنەم لە سابیتی کوڕی قەیسی (مێردم) نیە، بەڵام پێم ناخۆشە لە ئیسلامەتیدا تووشی کوفر ببم (واتە: دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووم و هاتوومەتە نێو ئیسلام، تووشی گوناح ببم، دەمەوێ لێی جیاببمەوە)! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئامادەی باغەکەی بدەیەوە (دیارە سابیت باغێکی مارەیی داوە بەو خێزانەی خۆی) ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی سابیتی کوڕی قەیسی کردو فەرمووی: باغەکەی لێوەربگرەوەو بە یەک تەڵاق دەستی لێ هەڵبگرە.**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٤٩٧١، والنَّسَائِي: ٣٤٦٣.

١٦٢- {عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّه عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ يَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ، فَيُطَلِّقُهَا، فَتَتَزَوَّجُ رَجُلاً فيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، أَتَحِلُّ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ؟ قَالَ: «لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا»}[1].

**واتە: عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی ژنێک کە پیاوێک دەیهێنی و دەبێتە هاوسەری، دوایی تەڵاقی دەدا، ئەو ئافرەتە مێردێکی دیکە دەکات، بەڵام ئەو مێردەی دووەمی تەڵاقی دەدات پێش ئەوەی لەگەڵی جووت بێت، ئایا بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ دەبێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، هەتا شیرینایەتییەکەی نەچێژێ، (واتە: دەبێ لەگەڵی جووت بێ، ئنجا دەتوانێ شوو بە پیاوی یەکەمی، یان هەر پیاوێکی دیکە بکاتەوە).**

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٤٩٦١، وَمُسْلِم: ٣٦٠٢.



دەربارەی

# سیفەتە خراپ و نـاپەسـندەکان

سەرەتا بە پێویستی دەزانم زۆر بە کورتی و پوختی ئاماژە بە هەندێ لە سیفەتە زۆر پەست و ناشرینەکان بکەین، دواتر هەندێکیان بکەینە ناوونیشان و فەرموودەی خۆشەویستیان ﷺ لەسەر بێنینەوە، وەک:

نهێنی ئاشکرا کردن، زێدەڕۆیی کردن لە تۆڵەسەندنەوە، ڕەزیلی و چرووک بوون، تووڕەیی و بێ حەوسەڵەیی، سیخوڕیی و جاسووسیی، دووڕوویی، زۆر ڕەخەگرتن، خۆ پێ پەسند بوون، ئەرکی خۆخستنە سەر شانی خەڵک، ڕاکردن لە کار، ترسنۆکی، زۆر پرتەپرت و بۆڵەبۆڵ کردن، ئێرەیی و حەسوودی، ڕق و کینەی دڵ و دەروون، خیانەت کردن، زەلیلیی و خۆ سووک کردن، گەڵتەجاریی جا گاڵتە بکات بە خەڵک، یان خەڵک گاڵتەی پێ بکەن، گومانی خراپ بردن، بە تەماع بوون و قەناعەت نەبوون، فرت و فێڵ و درۆ کردن، زمان شڕیی و جنێو فرۆشی، دڵڕەقیی و وشکی لە هەڵسوکەوت، تەنبەڵی، هەڵوەشاندنەوەی پەیمان، قسە هێنان و بردن، خۆ بە گەورەزانیی، بە چپە چپ قسە کردن، لە ناخدا ڕووخاویی و بێهێزیی و داتەپیوی، بێ ئومێدی و ڕەش بینی، ستەم کردن، تانەو تەشەر دان لە خەڵک، بێ ڕێزیی و سووکیی.

لەم پێشەکیە بە فەرموودەیەک دەست پێدەکەین، کە ئەوپەڕی ئومێد بە بەندە دەبەخشێ بەرانبەر بەزەیی و لێبوردەیی خوای میهرەبان، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ:

١٦٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَتَمَنَّيَنَّ أَقْوَامٌ لَوْ أَكْثَرُوا مِنَ السَّيِّئَاتِ! قَالُوا: بِمَ يَا رَسُوْلَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِينَ بَدَّلَ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵە کەسانێک هەن (لە ڕۆژی دوایی) خۆزگە دەخوازن گوناهیان زیاتر



---

(١) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٧٦٤٣، قال: إسناده صحيح ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح، انظر: (صحيح الجامع): ٥٣٥٩، (الصحيحة): ٢١٧٧، ٣٠٥٣.

**هەبووایە! (هاوەڵان) گوتیان: بۆچی، وە ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسانەن کە خوا خراپەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێ (هەندێ: دەڵێن: مەبەست پێ هاوبەش دانەرانە پێش ئەوەی ئیسلام بن، خاوەن گوناهو تاوان بوون، دواى هاتنە نێو ئیسلام خراپەکانیان بۆ دەگۆڕدرێن بە چاکە).**

**تێبینی: دیارە گۆڕین و تەبدیلی ئەو خراپە بە چاکە، بۆ ئەو کەسەیە کە تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە لە کردەوەی خراپ و ناگەڕێتەوە سەری، وە لە شوێنی خراپە خەریکی چاکەکاریی دەبێت، ئەمەش فەرمایشتی خوای بەرزو مەزنی لەسەرە وەک فەرموویەتی:** ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٠ ﴾الفرقان، **واتە: تەنها ئەوانەی کە تەوبە دەکەن و پەشێمان دەبنەوەو بڕوا دێنن و کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکەکان، وە بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.**

**دیارە هەر خوا دەزانێ ئەو جۆرە کەسانە کێن، چونکە فەرموودەی دیکەمان هەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرموویەتی:**

**١٦٤-** {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ أَحْسَنَ فِيما بَقِي، غُفِرَ لَهُ مَا مَضَى، ومَنْ أَسَاءَ فِيمَا بَقِي، أُخِذ بِمَا مَضَى وما بَقِيَ»}[1].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس تەوبە بکات و چاکەکاربێ دوای ئەم تەوبە کردنە لەوەی ڕابردوو دەبووردرێ، وە هەر کەس بەردەوامیش بێ لەسەر خراپەکاری، ئەوە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی لەسەر حیساب دەکرێ و پێی سزا دەدرێ!**

---

**(١) أَخرَجَهُ الطَّبَرَانِي في (الأوسط) ٦٨٠٦، انظر: (الصحيحة): ٣٣٨٦.**

## زمان شڕیی و جنێو فرۆشیی

**١٦٥-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ فَعَلَى البَادِيء مَا لَم يَعْتَد المَظْلُومُ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو دوو کەسەی کە جنێو بە یەکتر دەڵێن، گوناهی جنێوەکەیان دەکەوێتە سەر ئەو کەسەی دەستپێشخەری کردوە، بە مەرجێ ئەوەی دووەمیان سنوور نەبەزێنێ لە جنێو گوتن).**

**١٦٦-** {عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : «لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَتُؤْذُوا الأَحْيَاءَ»}[٢].

**واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێو بە مردووەکان مەڵێن، چونکە زیندووەکان ئازاری پێ دەخۆن.**

## نەفـرین و تـانەدان

**١٦٧-** {عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بالطَّعَّانِ، وَلاَ اللَّعَّانِ، وَلاَ الفَاحِشِ، وَلاَ البَذِيِّ»}[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار تانە لێدەرو نەفرین لێکەرو قسەی ناشیرینکەرو زمان شڕو جنێو فرۆش نیە (لەگەڵ هیچ کەس، بەرانبەر هەموو کەس، نەک تەنیا لەگەڵ مسوڵمانان).**

---

(١) أَخْرَجَهُ مسلم: ٢٤٨٧.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٨٢٣٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين.

(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي في الأدب المفرد: ٣١٢، وأَحْمَد: ٣٨٣٩، والتِّرْمِذِي: ١٩٧٧.

## قسەهێنان و بردن

١٦٨- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَتَدْرُونَ مَا الْعِضَةُ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «نَقْلُ الْحَدِيثِ مِنْ بَعْضِ النَّاسِ إِلَى بَعْضٍ، لِيُفْسِدُوا بَيْنَهُمْ»}[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا دەزانن (العِضَة) چییە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەر زاناترن، فەرمووی: گواستنەوەی قسەیە لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە، بۆ مەبەستی ئەوەی نێوانیان تێکبدرێ.**

١٦٩- {عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَنْقُلُ الْحَدِيثَ إِلَى الأَمِيرِ فَكُنَّا جُلُوسًا فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ الْقَوْمُ: هَذَا مِمَّنْ يَنْقُلُ الْحَدِيثَ إِلَى الأَمِيرِ، قَالَ فَجَاءَ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْنَا. فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷺ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»}[٢].

**واتە: هەممامی کوڕی حاریس دەڵێ: پیاوێک هەبوو (بەوە ناسرا بوو) کە قسەی خەڵک دەگوازێتەوە بۆ ئەمیری (کوفە)، ئێمەش لە مزگەوت (لە کوفە) دانیشتبووین، خەڵکەکە گوتیان: ئەوە ئەو پیاوەیە کە قسەی خەڵک بۆ ئەمیر دەگوازێتەوە (جاسووسی دەکات)، دەڵێ: پیاوە (جاسووسەکە) هات تاوەکو لە مەجلیسەکەمان دابنیشێ، حوزەیفە ﷺ (کە لە مەجلیسەکە بوو) گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (ڕاستەوخۆو بەبێ حیساب و لێپرسینەوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵک (بۆ ئەوەی نێوانیات تێکبدات).**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي فِي الأدب المفرد: ٤٢٥، انظر: (الصحيحة): ٨٤٥ .

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٦٠٥٦، وَمُسْلِم: ١٠٥.

**١٧٠-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِقَبْرَيْنِ، فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ؛ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَبْرِي مِنَ الْبَوْلِ؛ وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ»، ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِمَ فَعَلْتَ هذَا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»}[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای دوو قەبردا تێپەڕی، فەرمووی: خاوەنی ئەم دوو گۆڕە وا سزا دەدرێن، وە سزاش نادرێن بە هۆی گوناهی گەورە (واتە: گوناهەکان لەچاوی خەڵکی گەورە نین)، (دوو گوناهەکانیش ئەوانەن:) یەکێکیان خۆی پاک ڕانەدەگرت لە پرۆشکی میز، وە ئەوەی دیکە قسەی دەهێناو دەبرد لە نێوان خەڵکی و نێوانیانی بەو قسانە تێکدەداو ئاشووبی دەنایەوە، پاشان لقێکی تەڕو سەوزی دارخورمای هەڵگرت و کردیە دوو بەش، پاشان لەسەر هەر قەبرێک لقێکی چاند، گوتیان: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ! بۆچی ئەم کارەت کرد؟ فەرمووی: بەڵکو سزایان لەسەر سووک بکرێ تا ئەو کاتەی دارەکان شێدارو تەڕ بن.**

**١٧١-** {عَنْ بِلالِ بْنِ الْحَارِثِ الْمُزَنِيِّ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنَ الْخَيْرِ، مَا يَعْلَمُ مَبْلَغَهَا يَكْتُبُ اللَّهُ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنَ الشَّرِّ، مَا يَعْلَمُ مَبْلَغَهَا يَكْتُبُ اللَّهُ بِهَا عَلَيْهِ سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ»}[٢].

**واتە: بیلالی کوڕی حاریسی موزەنی ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: جاری وا هەیە پیاوێک (یان ژنێک) قسەیەکی چاک دەکات بێ ئەوەی بزانێ (پاداشتی ئەو قسەیە) چەندە، بە هۆی**

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢١٥، وَمُسْلِم: ٢٩٢.

(٢) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي (الكبير) ١١٣٦، وَصَحَّحَهُ مقبل بن هادي الوادعي.

ئەو قسەیەوە خوا ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنووسێ هەتا ئەو ڕۆژەی پێی دەگاتەوە (کە ڕۆژی دواییە)، وە جاری واهەیە پیاوێک (یان ژنێک) قسەیەکی خراپ دەکات بێ ئەوەی بزانێ (گوناهی ئەو قسەیە) چەندە، بە هۆی ئەو قسەیەوە خوا تووڕەیی خۆی لەسەر دەنووسێ هەتا ئەو ڕۆژەی پێی دەگاتەوە، (واتە: ڕۆژی دوایی).

## بوغزاندنی یەکتر و ئێرەیی بردن

**١٧٢-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی و حەسوودی بە یەکدی مەبەن، بەندەی خوابن و،پێکەوە برابن.**

## جنێودان بە دایک و باوک

**١٧٣-** {عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِنَ الْكَبَائِرِ شَتْمُ الرَّجُلِ وَالِدَيْهِ، قِيلَ: وَهَلْ يَسُبُّ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ، فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ، فَيَسُبُّ أُمَّهُ»}[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە گوناهە گەورەکان ئەوەیە پیاو جنێو بە دایک و باوکی بدات. گوترا: ئایا کەس جنێو بە دایک و باوکی**

---

(١) أَخرَجَهُ البُخَارِي فِي الأدب المفرد: ٤٠٨.

(٢) أَخرَجَهُ البُخَارِي: ٥٩٧٣، وَمُسْلِم: ٩٠.

دەدات؟ فەرمووی: بەڵێ، جنێو دەڵێ بە باوکی کەسێک، ئەویش جنێو بە باوکی دەداتەوە، جنێو بە دایکی دەڵێ، ئەویش جنێو بە دایکی دەداتەوە.

## به چپەچپ قسە کردن

**١٧٤-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»}[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون، با دوویان جیا لەوەی دیکە چپەچپ نەکەن چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خەفەتی پێ بخوات، وە گومانی لە دڵدا دروست بێ کە ڕەنگە باسی ئەو بکەن.**

**تێبینی: لە سێ حاڵەت ئەم چپە چپکردنە دروستە: (الصَدَقَة): دوو کەس پێکەوە ڕاوێژ بکەن، کە یارمەتی کەسێک بدەن هاوکاری ماددی بکەن، (الْمَعرُوف): یاخود چاکەیەکی مەعنەویی لەگەڵدا بکەن، یان ئامۆژگاری بکەن، یان لە هەڵەیەک بیگێڕنەوە. (الإصلاح) یاخود بۆ ئاشتەوایی و پێکهێنانەوەی خەڵک.**

## خۆ بە گەورەزانین

**١٧٥-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ»، قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَناً، وَنَعْلُهُ حَسَنَةً؟! قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ»}[٢].

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٩٣٢، وَمُسْلِم: ٢١٨٤، واللفظ لمسلم.

(٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٧٥.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک بە ئەندازەی دنکە گەردێک خۆ بە گەورە زانینی لە دڵدا بێ، ئەوە ناچێتە نێو بەهەشت، پیاوێکیش گوتی: پیاوی وا هەیە حەز دەکات پۆشاکی چاک بن و، نەعل و پێڵاوی باش و جوان بن (ئایا ئەوەش خۆ بەگەورە زانیە؟) فەرمووی: خوا جوانە جوانیشی خۆشدەوێ، بەڵکو خۆبەگەورە زانین ئەوەیە: کەسێک هەق قبووڵ نەکات و خەڵکیش بە سووک و کەم تەماشا بکات.**

**١٧٦-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَعَظَّمَ فِي نَفْسِه، أَوِ اخْتَالَ فِي مِشْيَته لَقِي اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْه غَضْبَانُ»}[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس لە دڵی خۆیدا خۆی پێ گەورە بێ، لە ڕۆیشتندا کەشخەو فیز بکات، کاتێ دەگاتەوە بە خوا، خوا لێی تووڕەیە.**

## موناقەشەکردن

**١٧٧-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ، الأَلَدُّ الْخَصِمُ»}[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان بوغزێنراوترینی پیاوان لە لای خوا (کەسێکە) زۆر موناقەشەو شەڕەقسەو کێشمە کێشم دەکات.**

**١٧٨-** {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾﴾الزخرف}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٥٩٩٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٢٣٢٥، وَمُسْلِم: ٢٦٦٨.

(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢٢١٨، والتِّرْمِذِي: ٣٢٥٣، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤٨.

واتە: ئەبو ئەمامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کۆمەڵێک گومڕانابن دوای ئەوەی هیدایەتیان وەرگرتوەو لەسەری بوون، جگە لەوانەی زۆر موناقەشەو کێشمە کێشم دەکەن (ئەوان بەرەو گومڕایی دەچن)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾﴾الزخرف.

١٧٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ جۆرە کەس هەن لە ڕۆژی دوایی دا خوا نایاندوێنێ و پاکیان ناکاتەوە لە گوناهان و، بە چاوی ڕەحمەت سەیریان ناکات، ئەوانیش: پیرێکی زیناکار، پادشایەکی درۆزن، هەژارێکی خۆ بە گەورەزان و لە خۆبایی.

## گاڵتەجاریی

١٨٠- {عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ جَدِّي ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ، وَيْلٌ لَهُ»}[٢].

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە باپیریەوە ﷺ کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سزای سەخت بۆ ئەو کەسەی قسە دەکات و درۆی (تێدا) دەکات بۆ ئەوەی خەڵک پێی پێبکەنن، سزای سەخت بۆ وی.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٠٢٣٢، وَمُسْلِم: ١٠٧.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٠٠٤٦، وَحَسَّنَهُ الألباني، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

## سپڵەیی و ناسوپاسگوزاری

١٨١- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أُبْلِيَ بَلاَء فَذَكَرَهُ فَقَدْ شَكَرَهُ، وَإِنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ»}[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چاکەیەکی لەگەڵ کراو باسی کرد ئەوە سوپاسگوزاریی کردووە، ئەگەر شاردیەوەو باسی نەکرد، ئەو سپڵەیی کردوە، بەرانبەر ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ کردوە.**

## پەیوەندی پچڕاندن

١٨٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ تُعْرَضُ كُلَّ خَمِيس لَيْلَةَ الْجُمُعَة، فَلاَ يُقْبَلُ عَمَلُ قَاطِعِ رَحِمٍ»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە دڵنیایی کردەوە (چاکە)کانی ئادەمیزاد بەرزدەکرێنەوەو ڕادەنوێنرێن (بۆ خوای پەروەردگار) هەموو پێنج شەممەیەک لە شەوی هەینیدا، جا کردەوەی ئەوانە وەرناگیرێ کە پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاندوە.**

١٨٣- {عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجَلَ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَة مَعَ مَا يُدَّخَرُ لَهُ مِنَ البَغِي، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ»}[3].

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ گوناهێک نیە کە هێندە بە پەلە خاوەنەکەی پەلکێش بکات بۆ سزای خوا (هەر لە**

(١) أَخرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٤٨١٦، انظر: (السلسلة الصحيحة): ٦١٨.

(٢) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ١٠٢٧٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ الألبَانِي.

(٣) أَخرَجَهُ البُخَارِي فِي الأدب المفرد: ٢٩، انظر: (الصحيحة): ٩١٨، ٩٧٨.

**دونیا)، سەرباری ئەوەش کە بۆی هەڵدەگیرێ لە دواڕۆژ، ئەوانیش ستەم و دەست درێژی، وە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی (ئەو دوو گوناهە زۆر بە پەلە خاوەنەکەیان تووشی سزا دەبن).**

**١٨٤-** {عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ: يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا، وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ»}[١].

**واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ مسوڵمانێک لە سێ ڕۆژ (و شەوان)، زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی ببـڕێتەوەو قسەی لەگەڵدا نەکات، (بە شێوەیەک) بگەن بە یەکتری ئەوەیان پشت هەڵبکات و ئەوەی دیکەش پشت هەڵبکات و قسەی لەگەڵ نەکات، وە باشترینیان ئەو کەسەیانە کە سەرەتا دەست دەکات بە سڵاو کردن (دەست پێشخەریی دەکات لە ئاشت بوونەوە).**

**١٨٥-** {عَنْ أَبِي خِرَاشٍ السُّلَمِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ هَجَرَ أَخَاهُ سَنَةً فَهُوَ كَسَفْكِ دَمِهِ»}[٢].

**واتە: ئەبو خیراشی سولەمی ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس بۆ ماوەی ساڵێک نێوانی لەگەڵ برا (یان خوشکە)کەی دابڕێ وەک ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێ.**

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٠٧٧، وَمُسْلِم: ٢٥٦٠.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي في الأدب المفرد: ٤٠٤، انظر: (الصحيحة): ٩٢٨.

## زێدەڕۆیی نەکردن لە کار پێسپاردن

١٨٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ العَمَلِ إلاَّ مَا يُطِيقُ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خزمەتکارەکان خواردن و پۆشاکیان بۆ هەیە (لەسەر خاوەنەکانیانە)، وە جگە لەوەی لە تواناياندایە کاری زیادیان نابێ پێ بسپێردرێ.**

## منەت کردن و شەڕاب خۆریی

١٨٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَمُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ (جۆرە کەس هەن) خوا تەماشایان ناکات لە ڕۆژی قیامەت: ئەوەی ئەزیەتی دایک و بابی داوە، ئەوەی بەردەوام بووە لەسەر خواردنەوەی شەڕاب (تا مردن)، ئەوەی خێرو چاکە دەکات و دوایی منەت لەسەر ئەو کەسە دەکات کە خێرو چاکەی لەگەڵ کردووە.**

(١) أَخرَجَهُ أَحْمَد: ٧٣٥٩، وَمُسْلِم: ١٦٦٢.

(٢) أَخرَجَهُ إِبْنُ حِبَّانَ: ٧٣٤٠، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادهُ صَحِيحٌ.

## مەڵێن: ڕووت ڕەش بێ

١٨٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُولُوا: قَبَّحَ اللَّهُ وَجْهَهُ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز (بە کەس) نەڵێن خوا ڕووی ڕەش بکات.**

## پەیمان شکاندن

١٨٩- {عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: مَا خَطَبَنَا نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِلاَّ قَالَ: «لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ، وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ»}[٢].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ نەداوین حەتمەن دەیفەرموو: ئیماندار نیە ئەو کەسەی ئەمانەتدار نەبێ، وە هیچ ئاینێکی نیە ئەو کەسەی بێ بەڵێن و پەیمان بێت.**

## ڕووخاویی و بێهێزیی و داتەپیوی

١٩٠- {عَنْ ثَوْبَانَ ﵁، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمُ الأُمَمُ، مِنْ كُلِّ أُفُقٍ، كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا»، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمِنْ قِلَّةٍ بِنَا يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: «أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ، وَلَكِنْ تَكُونُونَ غُثَاءً كَغُثَاءِ السَّيْلِ، يَنْتَزِعُ الْمَهَابَةَ مِنْ قُلُوبِ عَدُوِّكُمْ، وَيَجْعَلُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ»، قَالَ: قُلْنَا: وَمَا الْوَهَنُ؟ قَالَ: «حُبُّ الْحَيَاةِ، وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي فِي الأدب المفرد: ١٧٢، انظر: (الصحيحة): ٨٦٢.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٢٤٠٦، وعبد بن حميد: ١١٩٨، وأبو يعلى: ٢٨٦٣، وابن حبان: ١٩٤، والبَيْهَقِي فِي الكبرى: ١٢٤٧٠.

(٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢٤٥٠، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إِسْنَادهُ حَسَنٌ.

واتە: ثەوبان ﷺ خزمەتكاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نزیكە ئۆممەتان و گەلانی دونیا لە هەموو لایەكەوە دەورتان بدەن و لێتان كۆببنەوە، هەروەک چۆن خۆراكخۆران لە دەوری قاپی خواردن و لەسەر سفرە كۆدەبنەوە، دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە لەبەر كەمی ژمارەمان لەو ڕۆژە وامان بەسەر دێ؟ فەرمووی: ئێوە لەو ڕۆژەدا زۆرن، بەڵام وەک و بڵق و كەف و چڵكی سەر ئاو وان، (خوای دادگەر) ترستان و هەیبەتتان لە دڵی دوژمن دەردێنێت و بێ هێزی و وەهن دەخاتە نێو دڵەكانتانەوە، گوتمان: وەهن چییە؟ فەرمووی: خۆشەویستی دونیاو ڕق بوونەوەتانە لە مردن.

## ڕەزیلی و ترسنۆكی

١٩١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شَرُّ مَا فِي رَجُلٍ شُحٌّ هَالِعٌ، وَجُبْنٌ خَالِعٌ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خراپترین دوو سیفەت لە پیاودا[٢] هەبن بریتین لە: ڕەزیلیەكی زۆرو، ترسنۆكیەكی تۆقێنەر.

(شح) واتە: ڕەزیلی زۆر، (هالع) واتە: حەریص بوون لەسەر كۆكردنەوەی سەروەت و دەست نوقاندن. وە (جبن) واتە: ترسنۆكی، مەبەست لە (خالع) ئەوەیە كە ئەو كەسە هێندە دەترسێ، خەریكە دڵی دەربێ.

یەكێک لە هۆكارەكانی ئەم دوو سیفەتە زۆر جاران كە لە دایک و باوكان پەیدادەبن بریتیە لە منداڵ، وەک لەم فەرموودە ئاماژەی پێكراوە:

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٧٩٩٧، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح.

(٢) وە لە ئافرەت.

**١٩٢-** {عَنْ يَعْلَى الْعَامِرِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) يَسْعَيَانِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَضَمَّهُمَا إِلَيْهِ، وَقَالَ: «إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ»}(١).

**واتە: یەعلای عامری دەڵێ: حەسەن و حوسەین (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕایان دەکرد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ چوونە لای و هەردووکیانی لە باوەش کردو، فەرمووی: بە ڕاستی منداڵ هۆکاری ڕەزیلیی و ترسنۆکیە.**

**١٩٣-** {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّه (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُوْلَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ، فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَقَطَعُوا أَرْحَامَهُمْ، وَالظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}(٢).

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیل و چرووکی ئەوانەی پێش ئێوەی لەبەین برد، وە وای لێکردن خوێنی یەکدی بڕێژن و یەکدی بکوژن و پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنن، وە خۆتان بپارێزن لە ستەم، چونکە ستەم تاریکاییەکانی ڕۆژی دواییە.**

## خۆچوواندنی پیاوو ئافرەت بەیەکتر

**١٩٤-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ»}(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا نەفرینی کردوە لە ئافرەتانێک کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن، وە لە پیاوانێک کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن (جا لە جل و بەرگ بێ، یان لە سیفات).**

---

(١) أَخْرَجَهُ ابن ماجه: ٣٦٦٦، وقال البوصيري (٩٩/٤): هذا إسناد صحيح، وابن أبي شيبة: ٣٢١٨٠.
(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٤٥٠١، والبُخَارِي في الأدب: ٤٨٣، وَمُسْلِم: ٥٧٨.
(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٣٣٠، وَمُسْلِم: ٥٢٩.

## شاردنەوەی زانیاریی

١٩٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ، أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پرسیاری لێ بکرێ دەربارەی زانیاریەک ئەویش بیشارێتەوە، ئەوە لە ڕۆژی دوایی بە لغاوێکی ئاگرین لغاو دەکرێ (بە تایبەت ئەگەر زانیاریەکی دەربارەی ئایین بێ، واتە: عەقیدەو حەڵاڵ و حەڕام بێت).**

## گوناهی خۆ ئاشکرا کردن

١٩٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى، إلاَّ الْمُجَاهِرِينَ وَإِنَّ مِنَ الْمَجَانَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحُ، وَقَدْ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَيَقُولُ: يَا فُلاَنُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو ئوممەتەکەم دەبووردرێن لە گوناهان تەنیا ئەوانە نەبێ کە گوناح دەکەن و دوایی دێن لە نێو خەڵکی باسی دەکەن، لە دەرخستنی تاوان ئەوەیە کە کەسێک بە شەو کارێکی (خراپ) بکات، پاشان ڕۆژ هەڵبێ، لەکاتێکدا خوا (ئەو کارەی) بۆ داپۆشیوە، کەچی ئەو (لەلای خەڵک) بڵێ: ئەی فڵان کەس من شەوی ڕابردوو فڵان کارەو فڵان کارە (خراپەم) کرد، لە کاتێکدا شەوی تێپەڕاندبوو پەروەردگاری داپۆشی بوو، کەچی خۆی بەیانی دەکاتەوەو پەردەو پۆشتەی خوا لەسەر خۆی لادەدا (ئا لەمانە نابوردرێت).**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٣٦٦٠، قال الألباني: حسن صحيح.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي:٥٧٢١، وَمُسْلِم: ٢٩٩٠.

خوای بە بەزەیی کە خاوەنی ئەوپەڕی سۆزو بەزەیی و میهرەبانییە، جاری وایە چ وەک تاک، چ وەک کۆمەڵ، بەڵاو ناڕەحەتییەکیان بەسەر دێنێ و تاقییان دەکاتەوە، تاکو ئیمانەکەیان بەهێزتر بکات، چونکە ئینسان هەتا بە ناڕەحەتیی زیاتردا تێپەڕێت، بە پلەکانی ئیماندا زیاتر سەردەکەوێ، بەڕاستی ئەو گیـروگرفت و ناڕەحەتییانەی دێنە سەر ڕێی ئینسان، وەک مەشق و تەدریبن و ئینسان پێیان بەهێز دەبێ، ئێستا چەند فەرمایشتێک لەوبارەوە ئاماژە پێدەکەین:

## کێن ئەوانەی توند تاقی دەکرێنەوە؟

**١٩٧-** {عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ حُذَيْفَةَ عَنْ عَمَّتِهِ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعُودُهُ فِي نِسَاءٍ فَإِذَا سِقَاءٌ مُعَلَّقٌ نَحْوَهُ يَقْطُرُ مَاؤُهُ عَلَيْهِ مِنْ شِدَّةِ مَا يَجِدُ مِنْ حَرِّ الْحُمَّى قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَوْ دَعَوْتَ اللَّهَ فَشَفَاكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ بَلاَءً الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»}[1].

**واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی حوزەیفە دەگێڕێتەوە لە فاتیمەی پوریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە گوتوویەتی: هاتینە لای پێغەمبەری خوا سەردانمان کرد بەهۆی نەخۆشیەوە، لەناو خێزانەکانیدا بوو، مەتارەیەکیش هەڵواسرابوو تنۆک تنۆک ئاوەکەی دەڕژایە سەری (خۆیان وایان لێ کردبوو) لەبەر بەهێزی و گەرمی تایەکەی، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خۆ ئەگەر داوای شیفا لە خوا بکەی شیفات بۆ دەنێرێ؟ (بۆ داوای شیفای ناکەی؟) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان لە هەموو کەس زیاتر کە ناڕەحەتییەکانی دێنە ڕێ بە زەحمەتترو قورستر، ئەوە**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٧١٢٤، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، وهذا إسناد حسن.

پێغەمبەرانن، دوایی ئەوانەی دوای وانن، دوایی ئەوانەی دوای وانن، دوایی ئەوانەی دوای ئەوانن.



## لەش ساغەکان چ خۆزگەیەك دەخوازن؟

١٩٨- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَوَدُّ أَهْلُ الْعَافِيَةِ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حِينَ يُعْطَى أَهْلُ الْبَلَاءِ الثَّوَابَ، لَوْ أَنَّ جُلُودَهُمْ كَانَتْ قُرِضَتْ فِي الدُّنْيَا بِالْمَقَارِيضِ»}[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەش ساغەکان لە ڕۆژی دوایی دا، کە ئەو پاداشتە دەبینن دەدرێتە کەسانی نەخۆش و نەساغ و بە دەردو بەڵا، خۆزگە دەخوازن لە دونیا پێستەکانیان بە مەقەس ببڕدرایە (تاکو ئەوانیش هەمان پاداشتی نەخۆش و خاوەن گرفتاریەکانی دونیایان وەرگرتبایە).**

## بۆ خوا تووشی نەخۆشیت دەکات؟

١٩٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللّهَ لَيَبْتَلِي عَبْدَهُ بِالسَّقَمِ حَتَّى يُكَفِّرَ ذَلِكَ عَنْهُ كُلَّ ذَنْبٍ»}[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای گەورە بەندەی خۆی بە نەخۆشی تاقی دەکاتەوە، تا ئەم نەخۆشیە دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەموو گوناهەکانی.**

---

(١) أَخرَجَهُ التِّرمِذِي: ٢٤٠٢، انظر: (صحيح الجامع): ٨١٧٧.

(٢) أَخرَجَهُ الحَاكِمُ: ١٢٨٦، وَقَالَ: صَحِيح عَلىَ شَرطِهِما، انظر: (صحيح الترغيب والترهيب): ٣٤٣٥.

**٢٠٠-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يَزَالُ الْبَلاَءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ، فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ، حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام بەڵاو ناخۆشی تووشی پیاوو ئافرەتی بڕوادار دەبێت، لە خۆی و ماڵ و منداڵیدا، تا وای لێدێت کە دەگاتەوە بە خوای گەورە، ئەم بەندەیە هیچ گوناهێکی پێوە نەماوە.**

**٢٠١-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سمِعْتُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَصَبُ الْمُؤْمِنِ كَفَّارَةٌ لِخَطَايَاهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نەخۆشی ئیماندار، مایەی پاکبوونەوەیەتی لە گوناهەکانی (واتە: سڕەرەوەی گوناهەکانیەتی).**

## لەکاتی خۆشی دوعا کردن

**٢٠٢-** {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيبَ اللَّهُ لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالْكُرَبِ، فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَخَاءِ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پێی خۆشە لە کاتی تەنگانەو گرفتارییدا خوا وەڵامی دوعای بداتەوە، با لە کاتی بێ کێشەیی و دڵخۆشیدا زۆر دوعا بکات و لە خوا بپاڕێتەوە.**

---

(١) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٢٣٩٩، وقال: حسن صحيح، والبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٩٨٣٦.

(٢) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ١٢٨٢، وَالبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٩٨٣٥، انظر: (صحيح الجامع): ٧١٠٩.

(٣) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِي: ٣٣٨٢، وَحَسَّنَهُ الألباني.

## پاڕانەوە بۆ نەخۆش

٢٠٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَعُودُ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ، فَيَقُولُ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ، إِلاَّ عُوفِيَ»}[١].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەکی مسوڵمان نیە کە سەردانی نەخۆشێک بکات، کاتی مردنی نەهاتبێ، حەوت جاران ئەم دوعایەی بۆ بکات، بڵێ: (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ) ئەوە حەتمەن شیفای بۆ دێ و لەم نەخۆشیە چاک دەبێتەوە.**

## تایبەتمەندیەکانی ئۆممەتی ئیسلام

٢٠٣- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»}[٢].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لە ئۆممەتی من چاوپۆشی کردوە، لە هەڵەکردن و لەبیرچوون و، ئەوەی بە زۆر پێیان بکرێ.**

٢٠٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَجَاوَزَ لأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ، أَوْ تَكَلَّمْ بِهِ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢١٣٧، وَالتِّرْمِذِي: ٢٠٨٣، وقال: حسن غريب، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح.

(٢) أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ: ٧٢١٩، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البُخَارِي، انظر: (المشكاة): ٦٢٩٣.

(٣) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٢٧.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای زاڵ پایەدار چاوپۆشی لە ئوممەتی من کردوە، لەوەی کە بە دڵیدا دێت، مادام کردەوەی پێ نەکردبێ و قسەی پێ نەکردبێ و دەرینەبڕیبێ.**

**٢٠٥-** {عَنْ كَعْبِ بْنِ عِيَاضٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ فِتْنَةً، وفِتْنَةُ أُمَّتِي: المَالُ»}[١].

**واتە: کەعبی کوڕی عیاض ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە ڕاستی بۆ هەموو ئوممەتێک فیتنەیەک هەیە، فیتنەی ئوممەتی منیش ماڵ و سامانە.**

**٢٠٦-** {عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ عَذَابَ هَذِهِ الأُمَّةِ جُعِلَ فِي دُنْيَاهَا»}[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاریی ﷺ دەڵی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سزای ئەم ئوممەت (ی ئیسلامە) خراوەتە نێو دونیا (واتە: نەهامەتیەکەیان لە دونیا دەبینن، لە قیامەت پشوو دەدەن).**

**٢٠٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فِيما أَعْلَمُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەو شتانەی فێری بووم و زانیوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، (یەکێکیان ئەوەیە) فەرموویەتی: بێگومان خوا لە هەر سەد ساڵێکدا کەسێک دەنێرێ بۆ ئەم ئوممەتە تا ئایینەکەی نوێ بکاتەوە.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٧٥٠٦، انظر: (الصحيحة): ٥٩٢.

(٢) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ١٥٦ وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٩٧٩٨، انظر: (صحيح الجامع): ٢١٠٩.

(٣) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٤٢٩٣، والطَبَرَانِي في (الأوسط)، وَالحَاكِمُ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): ٥٩٩، وَقَالَ: أَشَارَ الإِمَام أَحْمَد إلى صِحَّةِ الحَدِيث، فَقَد ذَكَر الذهبي في سِير الأعلام: قال أَحْمَد بن حنبل من طرق عنه: إن اللّه يقيض للناس في رأس كل مائة من يعلمهم السنن وينفي عن رسول اللّه ﷺ الكذب قال: فنظرنا، فإذا في رأس المائة عمر بن عبد العزيز وفي رأس المائتين الشافعي.

**٢٠٨-** {عَنْ عَبْد الرَّحْمَنِ بْن الْحَضْـرَمِيِّ يَقُولُ أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أُمَّتِي قَوْمَاً يُعْطَوْنَ مِثْلَ أُجُورِ أَوَّلِهِمْ، يُنْكِرُونَ الْمُنْكَرَ»}[١].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی خەزرەمیی دەڵێ: لە کەسێکەوە پێم گەیشتوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: کۆمەڵێک هەن لە ئۆممەتی من، وەک پێشینەکان پاداشتیان پێ دەدرێ، (چونکە فەرمان دەکەن بە چاکەو) ڕێگری دەکەن لە خراپە.**

**٢٠٩-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «وَدِدْتُ أَنِّي لَقِيتُ إِخْوانِي؟»، قال: فَقَالَ أَصحابُ النَّبِيِّ ﷺ: أَولَيس نَحْنُ إِخْوَانكَ؟! قال: «أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَلَكِنْ إِخْوَانِي الَّذِينَ آمَنُوا بِي، وَلَمْ يَرَوْنِي»}[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆزگە چاوم بە براکانم بکەوتبایە، دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەدی ئێمە برات نین؟! فەرمووی ئێوە هاوەڵی منن، بەڵام براکانم ئەوانەن بڕوایان پێم هێناوەو نەیانبینیوم.**

**٢١٠-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ أُنَاسَاً مِنْ أُمَّتِي يأْتُونَ بَعْدِي يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوِ اشْتَرَى رُؤْيَتِي بأَهْلِهِ وَمَالِهِ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دڵنیابن کۆمەڵە خەڵکێک لە ئۆممەتەکەم، لە دوای من دێن، هەر یەکێکیان تەمەننا دەکات و خۆزگە دەخوازێ هەموو خزم و کەس و ماڵ و سامانی بدات لە پێناو بینینی مندا.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦٦٤٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٢٥٧٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.

(٣) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٦٩٩١ انظر: (صحيح الجامع): ٢٠٠٨.

## فەرموودەی قودسییەکان

(الحَديثُ القُدْسِيّ): بریتیە لەو فەرموودانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، جا هەر بێژەو لەفزەکە هی خوا بێ، یان تەنیا ماناکەی هی خوا بێت، بەڵام جگە لە قوڕئان، واتە: قوڕئان و فەرموودەی قودسی هەردووکیان هی خوای پەروەردگارن، لەگەڵ هەبوونی ئەو جیاوازیانەی خوارەوە:

## جیاوازی نێوان قوڕئان و فەرموودەی قودسی

١- قوڕئان هەمووی لە ڕێی جبریل (عليه السلام)ەوە هاتوە، بەڵام فەرموودەی قودسی جاری وایە جبریل هێناویەتی، جاری واش هەبووە خوا ئیلهامی دڵی پێغەمبەر ﷺی کردوەو خستوویەتیە دڵی موبارەکی.

٢- قوڕئان موتەواتیره[1]، واتە: دڵنیایی و یەقینمان هەیە، هەمووی تەواوەو ڕاستەو لە خواوەیە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەیە ڕاستە، هەیە لاوازە، هەیە هەڵبەستراوە، کەواتە: هەموو فەرموودەیەکی قودسی صەحیح نیە.

٣- قوڕئان دابەش کراوە بۆ چەند سووڕەت و ئایەت و حزب و بەشێک، بەڵام فەرموودەی قودسی وانیە.

٤- قوڕئان لە ناو نوێژ دەخوێنرێ، بەڵام دروستە نیە فەرموودەی قودسی لە ناو نوێژ بخوێنرێ.

---

(١) المتواترُ: ما رَوَاهُ جماعة في كُل طبقة من طبقات السَّنَد تَحيلُ تواطؤهم وتوافقهم على الكذب واستندوا إلى أمرِ مَحسوس.

٥- پاداشتی خوێندنەوەی قورئان شتێکی جێگیرو سەلمێنراوە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەمان فەزل و پلەو پاداشتی نیە.

٦- قورئان موعجیزەیەکی دەستەوسانکەرە بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین دەمێنێتەوە هەتا دونیا مابێ، بەڵام فەرموودەی قودسی موعجیزەو دەستەوسانکەر نیە.

٧- بڕوا نەبوون بە قورئان کوفرە، خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەچێتە دەر، بەڵام بڕوا نەبوون بە فەرموودەیەکی قودسی بە هۆی ئەوەی کە لاوازە نەک کوفر نیە، بەڵکو ئاساییە، (هەروەک زۆر فەرموودەی قودسی هەن کە لاوازن، لە ڕووی سەنەدەوە ناگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ).

٨- دروست نیە قورئان بە مانا بگێڕدرێتەوە، بەڵام دروستە فەرموودەی قودسی بە مانا بگێڕدرێتەوە.

### چەند فەرموودەیەکی قودسی

٢١١- {عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ عَنِ النَّبيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَلْتَمِسُ مَرْضَاةَ اللَّهِ، وَلاَ يَزَالُ بِذَلِكَ، فَيَقُولُ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ، لِجِبْرِيلَ: إِنَّ فُلاَناً عَبْدِي يَلْتَمِسُ أَنْ يُرْضِيَنِي، أَلاَ وَإِنَّ رَحْمَتِي عَلَيْهِ. فَيَقُولُ جِبْرِيلُ: رَحْمَةُ اللّهِ عَلَى فُلاَنٍ، وَيَقُولُهَا حَمَلَةُ الْعَرْشِ، وَيَقُولُهَا مَنْ حَوْلَهُمْ، حَتَّى يَقُولَهَا أَهْلُ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ، ثُمَّ تَهْبِطُ لَهُ إِلَى الأَرْضِ»}[1].

واتە: ئەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەندەی وا هەیە بەدوای ڕەزامەندیی خواوەیەو بەردەوام دەبێ لەسەر ئەوە، خوای زاڵی پایەدار بە جبـریل دەفەرموێ: فڵانە بەندەم بەدوای ڕەزامەندی منەوەیە،

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٢٤٥٤، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادهُ حَسَن.

**ئاگاداربە ئەوە ڕەحمەتی من ڕژایە سەری، (یانی: بەزەییم ئەوی گرتەوە) جبریل دەڵێ: ڕەحمەتی خوا لەسەر فلان بێ، وە هەڵگرانی عەرشیش ئاوا دەڵێن، وە ئەوانەی بە دەوریانەوەن وادەڵێن، هەتاکو خەڵکی هەر حەوت ئاسمانەکانیش ئاوا دەڵێن، پاشان ئەو (ڕەحمەتەی) بۆ دێتە سەر زەوی (واتە: خەڵکی سەر زەویش دوعای بۆ دەکەن، کە لێرە مەبەست پێی ئیماندارەکانن).**

**۲۱۲-** {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا الرَّحْمَنُ، وَأَنَا خَلَقْتُ الرَّحِمَ، وَاشْتَقَقْتُ لَهَا مِنْ اسْمِي، فَمَنْ وصلها وصلته، ومن قطعها بتته»}

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای زاڵی پایەدار فەرموویەتی: من بەزەییم (واتە: یەکێک لە ناوەکانم بەزەییە)، وە خۆشم بەزەییم دروست کردوە لە ناوی خۆمەوە، هەر کەس بیگەیەنێ و جێبەجێی بکات منیش دەیگەیەنم، وە هەر کەسیش بیپچڕێنێ، منیش دەیپچڕێنم.**

**۲۱۳-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يَزَالُونَ يَقُولُونَ: مَا كَذَا؟ مَا كَذَا؟ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ خَلَقَ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟»}[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار فەرمووی: ئۆممەتەکەت بەردەوام هەر دەڵێن: ئەوە چیە؟ ئەوە چیە؟ هەتا دەڵێن: ئەوە خوایە دروستکراوەکانی هێناوەتە بوون، ئەدی کێ خوای هێناوەتە بوون؟**

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي في الأدب المفرد: ٥٣، انظر: (الصحيحة): ٥٢٠.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٢٠١٤، وَمُسْلِم: ١٣٦.

٢١٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «قَالَ تَعَالَى: ثَلاَثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرّاً فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيْراً فَاسْتَوفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرموویەتی: سێ جۆرە کەس هەن من لە ڕۆژی دوایی دژایەتیان دەکەم، کەسێک بە ناوی منەوە سوێند بخواو بەڵێن بدات، کەچی سوێندو بەڵێنەکە هەڵوەشێنێتەوە، وە پیاوێک کەسێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەشی بخوات، وە پیاوێک کرێکارێک بگرێ، دوای تەواو بوونی کارەکەی مافەکەو کرێیەکەی پێنەدات.**

٢١٥- {عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ، فَأَخَذَ سِكِّيناً فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ، فَما رَقَأَ الدَّمُ حَتّى مَاتَ، قَالَ اللّهُ تَعالَى: بادَرَنِي عَبْدي بِنَفْسِهِ، حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ»}[٢].

**واتە: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێش ئێوەدا، (یانی: لە گەلان و ئوممەتانی پێش ئێوە) پیاوێک هەبوو برینێکی لێ پەیدابوو تەحەممولی نەکرد، چەقۆیەکی هێناو شادەماری دەستی خۆی بڕی، جا خوێنی نەوەستا هەتا مرد، خوای تعالی فەرمووی: ئەو بەندەی من پەلەی کرد بۆ خۆی ویستی خۆی بکوژێ، بۆیە ئەوە بە هەشتم لێ قەدەغە کرد.**

٢١٦- {عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَلَقَّتِ الْمَلائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَقَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئاً؟ قَالَ: لاَ، قَالُوا: تَذَكَّرْ، قَالَ: كُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ، فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا الْمُعْسِرَ وَيَتَجَوَّزُوا عَنِ الْمُوسِرِ، قَالَ: قَالَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ: تَجَوَّزُوا عَنْهُ»}[٣].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨٦٧٧، والبُخَارِي: ٢١١٤.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٣٢٧٦.

(٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ١٩٧١.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتە ڕووحی پیاوێک لەوانەی پێش ئێوەی کێشا (دوای مردن) پێیان گوت: ئایا کارو کردەوەیەکی باشت هەیە؟ گوتی: نەخێر، گوتیان بیر بکەرەوە؟! گوتی: من قەرزم دەدا بە خەڵک، وە فەرمانم بە ئیشکەرەکانم دەکرد، کە چاوەڕێی کەسی کەم دەرامەت و تەنگ دەست بکەن و پەلەی لێ نەکەن، وە ئەوانەی هەشیانە لە بەشێکی یان گشتی خۆش بن، خوا فەرمووی: ئێوەش لێی خۆش بن (واتە: ئەوە من لێی خۆش بووم).

**٢١٧-** [وَفِي لَفْظ: نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ، تَجَاوَزُوا عَنْهُ»][(١)].

واتە: لە ڕیوایەتی دیکە هاتوە: خوا فەرمووی: ئێمە لەو لە پێشترین بەوە، ئێوەش لێی ببورن (واتە: ئەگەر ئەو جارێک شایستە بێ بەوەی لە خەڵک ببوورێ، ئەوە خوای بە بەزەیی زۆر لە پێشترو بە ڕەحم و بەزەییترە بۆ ئەوەی لەو ببوورێ).

**٢١٨-** [عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا، أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ «قَالَ» فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ، فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ، «وَزَادَ» ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ «يونس»﴾][(٢)].

واتە: صوهەیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەهەشتیەکان چوونە بەهەشتەوە، خوا تبارک وتعالی دەفەرموێ: ئایا هیچ شتێکتان دەوێ بۆتان زیاد بکەم؟ دەڵێن: ئەدی ڕوومانت نەدرەوشاندۆتەوەو نەتخستووینەتە بەهەشتەوەو لە ئاگر دەربازت نەکردووین؟ دەفەرموێ: ئنجا پەردە لادەدا (و تەماشای زاتی خوا دەکەن)، ئیتر هیچ شتێکیان

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٧١٢٤، وَمُسْلِم: ١٥٦١.

(٢) أَخْرَجَهُ مسلم: ١٨١، والتِّرْمِذِي: ٣١٠٥.

**پێنەدراوە لە لایان خۆشەویستتر بێ لە بینین و تەماشا کردنی زاتی پەروەردگاریان، «لە گێڕانەوەی دی ئەم زیادە هەیە» پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۝٢٦﴾ واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە پاداشتی هەرەچاک و زیادەش هەیە.**

**٢١٩-** «إِذَا أَبْغَضَ عَبْداً دَعَا جِبْرِيلَ، فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانَاً فَأَبْغِضْهُ، فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ، إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانَاً فَأَبْغِضُوهُ، فَيُبْغِضُونَهُ ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الْأَرْضِ»}[1].

**واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر خوا ڕقی لە بەندەیەک بۆوە (بە هۆی زۆری گوناهو تاوانەکانیەوە) بانگی جبریل دەکات، دەفەرموێ: من ڕقم لە فڵان کەسە تۆش ڕقت لێی بێ، جبریلیش ڕقی لەو کەسە دەبێتەوە، ئنجا بانگ لە نێو خەڵکی ئاسمان دەکات (واتە: لە نێو فریشتەکان) دەڵێت: خوا ڕقی لە فڵان کەس دەبێتەوە ئێوەش ڕقتان لێ بێتەوە، جا ئەوانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە، پاشان (ئەم ڕق لێبوونەوەی) بۆ دەخرێتە سەر زەوی (ئیماندارانیش خۆشیان ناوێ و دەیبوغزێنن).**

**٢٢٠-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ، ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ، ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعاً وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعاً، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي، أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً»}[2].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٣٤١، وَمُسْلِم: ٢٦٣٧، وَابْنُ حِبَّان: ٣٦٥. {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ، فَقَالَ: يَا جِبْرِيلُ، إِنِّي أُحِبُّ فُلَانَاً فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، عليه السلام، قَالَ: ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا، قَالَ: فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، إِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ...

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٣٤٠، والبُخَارِي: ٦٩٧٠، وَمُسْلِم: ٢٦٧٥.

واتە: ئەبو هورێرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای بەرز دەفەرموێ: من لەگەڵ گومان بردنی عەبدی خۆمم بە من، وە من لەگەڵیم کاتێک یادم دەکات، جا ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بکات، منیش لە لای خۆم یادی دەکەم، بە پەنهانی، بەڵام ئەگەر لە نێو کۆڕێکدا یادو باسم بکات من لە نێو کۆڕێکی باشتر لە کۆڕەکەی ئەو یادو باسی دەکەم، وە ئەگەر بستێک لێم نزیک بێتەوە من باسکێک لێی نیزیک دەبمەوەو، ئەگەر باسکێک لێم نیزیک بێتەوە، من باڵێک لێی نزیک دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆیشتن بەرەو لای من بێ، من بە ڕاکردن بەرەو ڕووی دەچم.

تێبینی: ئەوەی لێرەدا هەمووی وێنە هێنانەوەیە ئەگەرنا خوای بێ وێنە ڕاکردن و، وێنەی ئەوانەی نیە، یان وەک لە فەرموودەی قودسی دیکەدا هاتوە دەفەرموێ: بەندەی من بە هیچ شتێک ئەوەندە لە من نیزیک نەکەوتۆتەوە وەک جێبەجێ کردنی فەڕزەکان و، بەردەوام بە کردنی سوننەتەکان لێم نیزیک دەبێتەوە تاوەکو خۆشمدەوێ، جا ئەگەر خۆشمویست، دەبمە ئەو چاوەی پێی دەبینێ و، ئەو گوێیەی پێی دەبیستێ و، ئەو دەستەی شتی پێ دەگرێ و، ئەو لاقەی پێی دەڕوات! خۆ خوا سبحانە و تعالی نابێتە چاوو دەست و گوێ و لاق!

کەواتە: ئەمە یانی چی؟ یانی: وای لێ دەکەم چاوی تەنیا لە ڕەزامەندیی من حەڕەکە بکات، وە گوێی هەر بۆ ئەو شتانە ڕادێرێ کە من پێم خۆشە، وە دەستی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بەکاربێنێ کە من پێم خۆشە، هەروەها بە پێی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بڕواکە من پێم خۆشە،واتە: ئەندامەکانی جەستەی لە ڕەزامەندیی من دا نەبێ جمموجۆڵ نەکەن، مەبەست پێی ئەوەیە، بابەتەکە مەجازە.

الحَمْدُ للّٰهِ الّذي بِنِعْمَتِهِ تتِمُّ الصَّالِحَات.

## نێـوەڕۆك

٢٢٠

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەڕزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره».

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە

07504671394 - 07824671394
فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

DESIGN
07504808081